## ژمارەی داهاتوو تایبەتە بە
# شێخ محەمەدی خاڵ

سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکاران

ڕەووف بێگەرد

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاجی کۆمپیوتەری

ئاسۆ سەعید

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، دوو مانگ جارێک دەریدەکات.


**ناونیشان**

سلێمانی- فولکەی یەکگرتن-

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

Tel: 3120690

**لە دەرەوەی کوردستان**

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

**E-mail**

Info@www.sardam.info

چاپخانەی (شڤان)


## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامد، سوارەی ئێلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، محەرەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، ئیسماعیل بێشکچی، عەبدولخالق مەعروف، هێمن مهابادی، حسێن حوزنی موکریان، ئەمین فەیزی بەگ، کامەران موکری، جەلال تەقی، محەمەد ساڵح دیلان، هەژار، عەلی ئەشرەف دەروێشیان، شاکر فەتاح، حسێن عارف

عەلائەدین سەجادی
لە قوتیلکەی مزگەوتەوە
سەری جوقاو هاتە دەرێ.
کە گەورە بوو بوو بەاشاهۆاو
بوو بە چرای مانگە شەوێ
یەکەم کەسێ بە تریفە
مێژووی دەریاچەی نوسیەوەو
بەڵام دوایی لە بەستێندا بوو بە تەمێ!

شێرکۆ بێکەس
1999



**پۆزش**

لە ژمارەی ڕابردوودا هەڵەیەك لە نووسینی ناوی ئامادەبوانی ئەم وێنەیەدا ڕوویداوە، بۆیە وێڕای داوای لێبوردن لە خوێنەران و ئەم بەڕێزانە سەرلەنوێ ناوەکان دەنووسینەوە: لەچەپەوە بۆ ڕاست: حسێن عارف، کەمال ڕەووف، شێرکۆ بێکەس، کاکەمەم بۆتانی، عەبدوڵڵا پەشێو، جەمال شارباژێڕی، جەلالی میرزا کەریم، عەبدوڵڵا عەباس.

## نوری مەحمود



*1965 لە سلێمانی لە دایك بووە.

*1985 بەشی وێنەکێشانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە.

*1988 یەکەمین پشانگەی تایبەتی لە گەلەری سلێمانی کردۆتەوە.

*1994 دووەمین پیشانگەی بەناونیشانی ڕەش و سپی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانیکردۆتەوە.

*بەشداری چەندین پیشانگەی هاوبەشی لە ناوخۆی هەرێم و دەرەوەی هەرێم لە ئەڵمانیا، کەنەدا، هۆڵەندا، کردووە.

# بێخ و بناوانی کورد

**میللەت، یا ناسیون، یا قەوم**

زوتر پەیڕەویکەری هەر ئایینێك پیان ئەوترێت میللەت، وەك میللەتی ئیسلام، میللەتی گاور، میللەتی جولەکە، ئەمانە با زمان و رەوشتیشیان جیا بوایە مادام پەیڕەویکەری ئایینێك بون هەر بە یەك میللەت ناو ئەبران. لەپاشا زاناکانی ئاوروپا کەوتنە سەر ئەو باوەڕە کە میللەت ئەوەیە زمان یا خوێن یا نەژادێکی سەربەخۆی ببێ و وشەی((ناسیون) یان بۆ ئەم مەعنایە لە باتی میللەت دانا. لەم دەورەی دواییەدا تۆزێ پێشتر کەوتن هەنگاوێکی دیکە بۆ ئەم مەعنایە هاوێژرا کە : گۆیا تەنها زمان یا خوێن یا نەژاد بەش ناکا بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا رەوشت و عادەت لە شادی و لەشیوەن، لە خەفەت و لەخۆشی، لە کاروباری مەڵبەندو بنەماڵەییش پێویستە، هێنرا بۆ ئەم کۆمەڵە مەعنایە وشەی((قەوم))دانرا[1].

کەوابو هەر کۆمەڵە مەردمێك کە لە رەوشت و خوێن و رەگەز و زمان دا تێکلاو بون ئەمانە بۆ خۆیان ئەبن بە قەومێکی تایبەتی و جوێ ئەبنەوە لە کۆمەڵە مەردمێکی تر. لێرەدا بەبێ ئەوە بە شوێن بەڵگە دا بسوڕینەوە بە ئاشکرا دەزانین کە قەومێك هەیە ناوی ((کورد))ە و بە یەك زمان قسە ئەکەن و لەسەرەتای ژیانیانەوە تا ئێستا هاوبەش و شەریکن لە شادی و سرودو لاوانەوە و شیوەن هۆنینەوەی شعوری کۆمەلایەتی و سەر گوزەشتی و جەنگی ناو خۆیان و دەورو بەریانا" کە ئەمانە ئاوێنەیەکی هەرە روناکن بۆ بینین و ناسینی چۆنیەتی خوو رەوشتی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی هەموو قەومێك. دیسان عالمە نەژادشناسەکانی وەکو((ریچ))و ((سولاك))و ((فون لۆشان))و ((ئوژن پیتار))و گەلێکی تریش بۆیان ساغ بوەتەو کە قەومێك هەیە یەك خوێنیان هەیە و ناویان(کورد)ە ئینجا ئێمەش بەپێی توانا ئەمانەوێ لەم روەی دواییەوە کە ئێستا پێی ئەڵین ((مێژوی ئەدەب)) بۆ لاوانی دوا



رۆژی کورد لێوە بدوێن و قەومەکەمان لە سەرەتای ژیانیانەوە لەم ئاوێنەیەدا پیشان بدەین.

ناوی ئەم کتێبە ((مێژوی ئەدەبی کوردی))یە و ئەبێت لە ئەدەبی کورد بدوێت، بەلام ئەمە پێویستی بزانرێ ئەو قەومە ئەدەبەکەی هەیە چییەو چە کەسە، لەبەر ئەوە بەشێکی زۆر لە بەرگی یەکەمی کتێبەکە بۆ دۆزینەوەی کورد و سەرچاوەی کورد داگیر ئەکرێ کە ئەمە تا ئێستە بە تەواوی قسەیەکی ساغ لە باری ((کورد))دا بە راستی نەدراوە بە دەستەوە لام وایە ئەم باسە لە باسی ئەدەبەکە بە کەڵکتر ئەبێت و پاشەڕۆژی مێژو چاکتر رون ئەکاتەوە، بەو بۆنەوە دور نیە قازانجی لەو زیانە زیاتر بێت کە لادانە لە باس.

[1] ئیمڕۆژ بۆ جیاکردنەوەی نەتەوە((خوێن)) باوی نەماوە – دانەر لە چاپی دووەم–

کورد: لە لایەن بناغەی کوردەوە گەلێ کەس لە ڕۆژهەلاتی ناسەکان و لە زاناکانی ڕۆژهەلاتیش لێوەدواون، بەلام ئایا باسەکە گەینراوەتە ئەنجام بەجۆرێکی وەها کە بە پاك کراوی لەبەردەم پیاودا دای بنێن یان نە؟. ڕەنگبێت نەبو بێت چونکە جارێ مێژوو نوسەکانی ئیسلامی و عەرەب هەریەکە بە جۆرێ پیشانیان داون!.

سەیر ئەکەیت یەکێکی وەکو((مسغر )) دەمێك ئەلێت: (لە بەچکە دێوەکانی دەوری سلیمان پێغەمبەرن!) دەمێك ئەلێن( لەپاشماوەی ئەو ئادەمیزادانەن کە ئەکران بە خۆراکی مارەکانی سەر شانی زوحاك!) دەمێکیش ئەلێت: (لەنەتەوەی صعصعەی کوڕی نزاری کوڕی معدن و سەرچاوەیان ئەچێتەوە سەر غسانی!) لە لایەکی تریشەوە ئەلێت: (لەنەتەوەی ئەسفەندریار ومەنوچهرن!) کە ئەمانە فارس بوون.

(ابن حوقل) ئەلێت: (کوردی کوڕی ماردی کوڕی عمرو!). (طبری)و(فەیروزابادی) بە و ڕێگەیەدا چون کە گوایا ئەمانە ئەچنەوە سەر کوردی کوڕی عمروی موزیقیا و، وردە وردە سەرەو ژور ئەبنەوە بۆ یعربی کوڕی قحطان و لەوێوە بۆ سامی کوڕی نوح!!. لەسەر قسەی ئەمانە ئەم ولاتی کوردەواری‌یە ئەبێت چۆڵ و هۆڵ بو بێت تا ئەو وەختە ئەمانە لە دەورو بەری پێنج سەد سالێك پێش میلاد دا چوبن و ئاوایان کردبێتەوە!.

لە ڕۆژهەلات ناسەکان ((مینورسکی)) لە((دائرە المعارفی ئیسلامیدا)) ئەلێت:-

((دورنیە قەومی کورد لەوەختی خۆیدا لەڕۆژهەلاتی ئێرانەوە هاتبێتە ڕۆژئاوای و لەو شوێنەدا خۆیشی قەومێکی لێبوبێت وەکو((کارود)) و لەگەڵ ئەمانە تێکلاو بوبێت، و بوبن بەیەك)). هەر مینورسکی لە زمانی ڕۆژهەلاتی ناس((تورودانگین)) ئەیگێڕێتەوە کە گوایا ئەلێت: ((لە هەندێ لە گۆڤارەکانا چاوی بە دوو پارچە لەوح کەوتوە وێنەیان لەسەر بوەو تاریخیان ئەگەڕێتەوە بۆ دو هەزار ساڵ پێش میلاد، گوایا وا پیشان ئەدەن کە لە ولاتی ئاشوردا ولاتێك هەیە پێی ئەلێن ((کار-داکا)) ئەمەش وا پیشان ئەدا کە قەومی کورد لەو شوێنەدا بوون)) هەروەها ئەلێت: ((لە گێڕانەوەی عەرەب و ئەرمەندا وا دەر ئەکەوێ کە زەوی و زاری- ولاتی((کارود)) زۆر تەنگ بوەو سنوری ولاتی((کوردئین)) بۆ ئێمە بە تەواوی دەرناکەوێت، ئەوەندە هەیە(( سە)) شار هەبوون لە دەروبەری ((دجلە)) ئەتوانین بەهی ئەوانی بناسین. وەکو ((سارین)) ((ستالکا))(پنیاکا)) کەفنیکی ئیستەیە. لە باسەکەی ڕۆژهەلاتی ناس ((سترابو)) وا دەرئەکەوێ کە وشەی ((کوردوا)) سەر دەمێك بەو کێوانە ئەوتران کە لە بەین((دیار بەکر)) و((موش)) دان.

هەرجۆر بێت قەومی((کاردخوی)) هەبوون ئەوەندە هەیە وشەی ((خوی)) لەشێوەی ئەرمەنیدا بۆ جمع بەکار هێنراوە- (کەوا بو((خوی)) لە ئەرمەنیدا وەکو((کان)) لە کوردیدا وایە، وای لێدێتەوە یەعنی (کوردەکان)- کارود لەزمانی ئاشوریدا بەمانا بەهێزو ئیش کەرە. لە لایەکی تریشەوە لێکچون لە بەینی ئەو وشانەو وشەی ((خالدی))دا هەیە. خالدی‌یەکان لە زەمانی ئاشوریەکانا پێیان ئەوتن((ئورارتو)) چونکە لەدەوربەری کێوی ئارارات دائەنیشتن. لەدوایی هاتنی سەدەی نۆهەمی پێش میلاد ئەم خالدیانە لە ئەرمەنیەدا هەبون حکومەتێکی بەهێزیان دامەزراندو لەوانەیە تا سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش میلاد لە دەوروبەری دەریاچەی ((وان))دا ژیاون.

قەومی کارود لە قەومەکانی سامی بن یان نە، دانیشتوی ڕاستی ولاتەکەی خۆیان بن یان نە، ئەوی شکی تێدا نەبێت ئەوەیە ولاتەکەیان ((کاردشوی)) کۆن نیشتمانی ئم قەومی کوردی ئێستەیە بوە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەبێت ئێمەدان بەوە دا بنێین کە وشەی ((کوردشوی)) لەگەڵ وشەی ((کورد))دا لەوتەدا هاوبەشن، ئەمەش لەم سەرەتای چەرخی بیستەمەدا دەرکەوتووە.

دیسان ئەگەر جارێکی تر سەیری ئەم باسە بکەین وامان بۆ دەرئەکەوێت کە قەومی کورد لەگەڵ خالدیەکانا یەکن چونکە ڕۆژهەلاتی ناس( ریسك) ئەلێت: ((خالدی، کوردی، الکرد)) هەموی لەگەڵ وشەی ((کوردیای)) یەکن و یەك مانایان هەیە)).بە ڕاستی ڕۆژهەلاتی ناس((هبشمان)) کۆششێکی زۆری کردوە بۆ ئەوە کە((کوردریخ- کوردیخ))و (کورتیوی)) بکاتەوە بەیەك، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو جیاوازیە زمانیەکە((هارثمان))و ((نۆڵدکە))دایان ناوە نا بێتە کۆسپ بۆ ئەوە شکڵەکەیان تێکلاوبێت" چونکە نۆڵدکە هەرخۆی ئەلێت وشەی ((کارتیوای)) لە لوغەتی ئارامیدا وشەی ((کارثاویە)) لە عەرەبیدا ئەمانە هەردوکیان بەسەر قەومی کورددا ئەوترێن((هوفمان)).

ڕۆژهەلاتی ناس((سیرسیدنی سمیث) لە ژێر ناوی((کوردستانی کۆن)) دا پاکژیی باسەکەی ئەلێت:

((دور نیە ئەو هەرێمە کە ڕۆژهەلاتەکەی کەرکوکە و ڕۆژاوانەکەی شیوی خاپور، لای شمالی دەریاچەی وان و لای جنوبەکەشی ولاتی بابلە قەومی((شوبار))ی لیێ دانیشێت کە گەلێ جار سومریەکان هەندێکی یا هەمویان داگیر ئەکرد، شتێکی وا بەرچاو ناکەوێ کە ئاشنایەتی لە بەینی لوغەتی دانیشتوانی ڕاستەقینەی ئەو شوێنە و لوغەتی (سامی) یا، ئاری(هیندو- ئەوروپی)دا پەیدا بکا، هەروەها ئەم پچرانەی لەگەڵ لوغەتی سومریەکانیشا هەر هەیە. لە دەوروبەری (2252)ی پێش میلاد هەموو کوردوستان پارچەیەك بو لە ولاتی (سارگون) پادشای(ئاکاد)و هی جێ نشینە کەشی(نارام سین)بو. لەدەوروبەری سێیەمین حکومەتی (ئوور)دا لە(2300-2150)ی پێش میلاد ئەو بەشە کوردوستان کە کەوتبوە ڕۆژهەلاتی(دجلە)ە وەکو هەرێمی (سیمورو) کە(ئاڵتون کۆپری)یە دو ناوچەی (للبو) کە حەلوانەو(ساسرو) لەگەڵ (ئوربیللوم) کە هەولێرە

لەلایەن ئەم حکومەتی ئوورەوە گەلێ جار لەشکری تێئەهێنراو وێران ئەکرا.

لە بەینی سەدەی دەهەم و سەرەتای سەدەی نۆهەمی پێش میلاد دا ئارامیەکان خۆیان گەیاندە شیوەکانی(خاپور) و هەموو ولاتی(خوری) کۆنیان داگیر کرد، ئەم ولاتە لە بەین سەدەی چواردەهەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا لەژێر چاودێری ئاشوریەکانابو. ئاشوریەکان هەموو جار لەبەرئەوەی کوردەکان هەر خەریکی ئاژاوە و هەرابون بەرامبەر بەوان چاویان ئەبڕیە ولاتەکەیان بۆ ئەوە بیخەنەژێر دەست خۆیان. لە بەڵگەکانی سەدە(13)ی پێش میلاد وا دەرئەکەوێ کە هیچ گۆبەندێك لەم هەرێمەدا روی نەداوە تەنیا ئەوە نەبێت کە قەومێك بەناوی(پاپهی)یەوە پەیدا بون و ئەم ناوەش هەتا ئەم دەوری دوایییە بە(کورتی) ئەخوێنرایەوە. هەندێ کەس ئەم ناوە لەگەڵ ناوی (کورد)دا بە یەکێك ئەزانن، بەڵام لەم ئاخرەدا بەڵگە دۆزراوەکانی (بوغاز کوی) وا پیشان ئەدەن کە قەومێکی تر هەبوو بەناوی(پاپانخی)یەوە، دور نیە ئەم ناوە لەگەڵ ناوی(پاپخی)دا یەك بگرنەوە بەڵام لەپێشا بە هەڵە خوێنرابێتەوە. لە ناوەندی چەرخی (13)دا (حیثی) یەکان ئەهاتن پروپاگەندەیان بە پێچەوانەی ئاشوریەکان بڵاو ئەکردەوە بەڵام تیایا سەرنەکەوتن.

ئەبی ئەوەش بزانین کە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردوستان پابەندی شارستانێتی(شوباری، کەلدانی و ئاشوری)یەکان بون. ئەمەشمان بە بەڵگە بازرگانی و قضائیة دۆرزاوەکانی دەوری کەرکوکدا بۆ دەرئەکەوێ کە تاریخیان ئەگەرێتەوە بۆ سەدەی (15و 16)ی پێش میلاد، هەرچەندە هەندێ ناکۆکی و دوبەرەکی لە بەینی دانیشتوانی ئەم ولاتەدا هەبوو بەلام لەگەڵ ئەوەش هەمویان لە ئایین و کۆمەلایەتی و رەوشت و یاسادا وەکو یەك وابون و بەرەنگی شارستانێتی حەوزی (دجلە) رەنگیان گرتبوو.

لە بەڵگەی ئاشوریەکانی سەدەکانی(19، 18، 17)ی پێش میلاد وا دەرئەکەوێ کە بەهۆی کۆچ کردنی شەعبی ئاری(هیندو– ئاوروپی) لەرۆژهەلاتی دەریای رەشەوە بۆ هەرێمە جنوبیەکانی گۆڕانێك بەسەر رۆژهەلاتی کوردوستاندا هاتوە. لەو سەردەمانەدا کە ئاشوریەکان رویان کردوبوە بڕاندنەوە گەلێ جار ناوی کورد ئەبینرێ، بە تایبەتی ((گەزەنەفون)) لە گەڕانەوەکەیدا لە(401)ی پێش میلاد هەمو دەم ناویان دێنێت.

ئەو کەسەی کە ئەیەوێ لە بناوانی کورد ومێژویان بکۆڵێتەوە ئەبێت چاوی لەو قەومانەش بێت کە لەکێوەکانی کوردوستان پێکەوە ژیاون" وەکو کورد، ئاشور، تورکمان ئەرمەن. مەبەست بە چاولێ بونەکە سەیرکردنیان نییە لەلایەن خوێن و رەگەزەوە بەڵکو تەماشاکردنی زمان و لوغەتەکەیانە، ئەگەر بەم چاوەوە سەیر بکەین ئەوە ئیتر هیچ گومانی تێدا نابێت ئەو (کاردخوی) یانەکە(گەزەنەفون) باسیان ئەکا هەر قەمی کورد بوون و هەر ئەوانە بوون کە بەو جۆرە ئارەزووی سەر بەخۆیی و ئازادییان کردوە، بۆیەش وایان کردوە چونکە زمانەکەیان سەربەخۆ بووە.

لەم دەورەی دواییەدا بیروباوەڕی ئەو زانایانە کە لە لوغەتی کوردی ئەکۆڵنەوە بە تەواوی گۆڕا، و بەڵکو ئەڵێن: زمانی کوردی و نەبێت لە فارسیەوە وەرگیرا بێت یاخود ئەو بێت و تێکدارابێ، بەڵکو زمانێکی تایبەتی سەربەخۆیە و هەر لەزەمانی کۆنەوە هەڵگێرو داگێڕی خۆی جوێ بوە، چونکە ئەم گەلێ کۆنترە لەو فارسیە کۆنەکە پارچە لەوحەکەی (دارا)ی پێ نوسراوەتەوە. ئەگەر ئەمە راست بێت پێوستە زاناکانی تاریخ دان بەوەدا بنێن کە زمانی کوردی لە سەدەی شەشەمی پێش میلاد دا هەبووە، نەوەك هەر هەبووە بەڵکو زمانێکی سەربەخۆ بووە، و قەومی کورد لە قەومەکانی هیندو ئاوروپین و لەو وەختەوە کەمێدیەکان هاتونەتە میدیا و فارسەکان چونەتە فارسەوە ئەمانیش چونەتە کوردوستانەوە. جا ئەگەر بکەونە سەر ئەم باوەڕە لەو تەنگوچەڵەمەیە رزگاریان ئەبێت کە بڵێن تاریخێکی تۆزێ نزیك لەباری چونە کورد بۆ کوردوستان دوای (650)ی پێش میلاد بووە، چونکە بەڵگەکانی ئاشوری کە تاریخیان بۆ پێش ئەم تاریخە ئەگەڕێتە لەم بابەتەوە هیچ باسێك ناکەن. هەروەها ئەو کەسانە کە ئەڵێن زمانی کوردی زمانی فارسیە و تێکدراوە دراساتی عیلمی و باسی تاریخی گەلێ پێچەوانەی بیروباوەڕەکەیانە).

لە زاناکانی کورد خوا لێ خۆش بو(امین زکی بەگ)ئەڵێت:

(ئەم کوردستانە کە نیشتمانی ئادەمیزادی دوهەم بوەو لەوێوە بڵاوبونەتەوە بە دنیادا لە بەرەبەیانی تاریخەوە قەومەکانی زاگرۆسی لێدائەنیشێت کەپێیان ئەوتن(لولو)و (گوتی)و (کاسی)و(خالدی– کالدی)و (سوبارو– هوری).عیلامیەکان لەو پەڕی رۆژهەلاتی جنوبی ئەم خاکەوە دائەنیشتن، لەبەر هەندێ لێکچونی شێوەی زمانەکەیان گەلێ کەس لەرۆژهەلاتی ناسەکان ئەڵێن ئەم قەومانە هەموو لەنەتەوەی قەوقاسین. ئەم شەعبانە بێجگە لەعیلامیەکان هەمویان ئەبن بە بناغەی قەومی کورد، لە دەوری (سومری)و (ئاکادی)و سەرەتای ئاشوریەکاندا بزوتنەوەیەکی سیاسی سەیریان ئەگێڕا.

وا دەرئەکەوێ لافاوی هاتنی ئاریەکان(هیندو– ئاوروپی) سەرەتا بۆ کێوەکانی زاگرۆس و لەپاش بۆ رۆژهەلاتی رۆژئاوای– کە ئەم کۆچ کردنە لە سەرەتای سەدەی دەهەم و نۆهەمی پێش میلادەوە بوبێت– پاشماوەی دانیشتوە راستیەکانی زاگرۆس و کوردوستانی خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆی و هەموی کردوە بە ئاری. ئەمانە کە سەرەو خوار بوونەوە شەعبی مێدی لەهەمویان بەهێزتر بون چونکە دانیشتنی سەرەتایان لەرۆژهەلاتی دەریای ورمیەوە ئەم دەسەلاتەی دابونێ ئینجا لەپاش ئەوان قەومە ئاریەکانی–تریش وەکو: (پارس، مانای، پارسیوی، پارپ، کاردشوی) کۆچیان کردو هاتن. وا

دەرئەکەوێ تاریخی هاتنی قەومی کاردشوی کە گەزەنەفون لە(401)ی پێش میلاد توشیان بوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش میلاد(سیرسیدنی سمیث).

ئەگەر ئەم قسەیە وابێت بڵێن– وەکو هەندێ لە زانایانی بەڵگەو مێژو ئەڵێن– ئاشنایەتیەکی زۆر هەیە لە بەینی رەچەڵەکی قەومی کورد و شوێن بنجی ئەوەڵیان و لەبەینی دەستەی یەکەمدا کە هەموو قەومەکانی زاگرۆسی ئەوەڵن. کەوابو بۆ ئەو کەسە یەکەم و دوهەم بناسێ" ئەوا بە کورتی باسی ئەکەین:

***1—دەستەی یەکەم:*** قەومەکانی زاگرۆس: 1–(لولو)یا(لولوبوم) وا دەرکەوتوە کە ئەم قەومە لە هەرێمی (زەهاو– شارەزور– سولەیمانی) دائەنیشتن، بەڵام نازانرێ کە کەی هاتونەتەی ئەوێ لەپاش لەگەڵ گۆتیەکان تێکڵاو بون لەوڵاتی سولەیمانی ئێستەدا پێکەوە رایان ئەبواردو وڵاتی ((هالمان– حەلوان)) یشیان خستە ژێر دەسەڵاتیخۆیان. ((ئەمین زەکی)) هەندێ ئەڕواو لە پاشا ئەڵێت:– لە بەڵگەکانی ئاشوری دەوری (ئاشور ناصر پال) ی دوهەم وا دەر ئەکەوێ کە ئەم وڵاتی لولویە شارستانی و ئاوەدانیەکی چاکی تێدابوەو مەردمەکشی دەستێکی باشیان بوە لە هونەرو پیشەسازیدا، تەنانەت ئەم پادشای ئاشوریە گەلێ لە پیشەسازەکانی برد بوو بۆ وڵاتی ئاشور. پرۆفیسۆر(سپایزر) ئەڵێت: ئەم لولویانە باپیرە گەورەی لوڕی ئێستەن.

***2–(گۆتی)***یەکێکن لەقەومەکانی زاگرۆس، لە(2649)ی پێش میلاد دا وڵاتی سومر و ئاکادیشیان داگیر کرد، ئەم دەسەڵاتەیان (125)ساڵو (40) رۆژ درێژەی کێشا. لە ساڵی (2524)ی پێش میلاد دا پادشای ((ئوور)) رەچەڵەکی ئەمانەی دەرهێنا بە ناچاری گەڕانەوە بۆ کێوەکانی زاگرۆس. کە کاسیەکان لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمی پێش میلاد پەلاماری وڵاتی بابلیان دا بۆ ئەم پەلامارە گۆتیەکانیشیان لەگەڵ بون. لەوشتانە کە لەبەڵگەی ئاشوریەکان وەرئەگیرێت هیچ شکی تێدا نامێنێتەوە کە کێوەکانی زاگرۆس نیشتمانێکی قەومی بوە بۆ ئەم شەعبی ((گۆتی)یە.

دکتۆر سپایزر لە کتێبەکەیا: (قەومەکانی مەعبینی بین النهرین) لاپەڕە (117) ئەڵێت(ئەم تیرە و هۆزانە کە ئێستە بە کورد ناو ئەبرێن و نەبێ لە هیچ دەورێکا بە قەوقاسی ناسرابێن. بەڵێ ئەڵێ ئەم تیرانە لە هەندی رەوشت و شێوەی قسە کردندا لێك جوێ ئەبنەوە وەکو سەیر ئەکرێ کە یەکێکی سولەیمانی ناتوانێ بە تەواوی لەگەڵ بادینێکدا قسە بکاو بە تەواوی لێك بگەن، هەروەها لە بەینی کوردەکانی ئێستەدا گەلێ ئەرمەن و رەگەزی سامیو ئاری تر هەیە وەکو بەڵگە تاریخیەکان ئەمەمان پیشان ئەدەن. جا لەبەر ئەمە ناتوانین بڵێن قەومی کورد هەموو لە ریشەیەکی تەنهاو سەربەخۆوە هاتون !. پێ ناوێ بڵێن دانیشتوە ئەسڵیەکانی کوردستان لەگەڵ لە قەومەکان پێك هاتووە چونکە شتێکی ئاشکرایە، ئاشکراییەکەشی لەبەر ئەوەیە کە لەدەوری سەرەتای تاریخدا ئەمانە لەگەڵ هەندێ لە کۆچەریەکانی ئاشورو ئارامی پێکەوە لەکێوەکانا رایان ئەبوارد. لەپاشا کە ئاریەکان دەسەڵاتیان بەسەر ئەم وڵاتەدا پەیدا کرد هەندێ ڕەگەزی ئێرانیش هاتن لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتەکەدا تێکڵاو بون و بون بەیەك.

لەگەڵ ئەمەشدا ئینکاری ناکرێ کە هەندێ لە رەگەزی کۆنی قەومەکانی زاگرۆس ئێستەش لەناو کوردەکانا هەر هەیە. لەمەوە و سەیرکردنی لوغەتەوە دەرئەکەوێ کە قەومی کورد بەشێکن لە بەشەکانی زاگرۆس، ئەمانە هەرچەندە گەلێ جار توشی تاڵان و چەپاوی بێگانە بوون بەڵام هەمو دەم ئاگاداریی سەربەخۆیی تەبیعی و ئازادیی و پاراستنی عەشرەتیی خۆیانیان هەر کردەوە و هەر وەخت کە ترسی پەلاماری بێگانەیان بوبێت چونەتە کێوەکان، کە ئەو لافاوە بەسەر چوبێت هاتونەتە خوارەوە و شارو گوندەکانی خۆیانیان ئاوەدان کردۆتەوە وەکو ئێستەش ئەو رەوشتەیان هەر هەیە.

***3–(کاسای– کوسی– کوشو)*** ئەمانەش یەکێکن لە قەومەکانی زاگرۆس، سەرەتا لە ناوچەی ((کرماشان– قرمسین)) نیشتەجێ بون بەڵام تاریخی هاتنیان نازانرێ، ئەوەندە هەیە وەکو قەومەکانی تری زاگرۆس هەر دانیشتوی راستی وڵاتەکە بون و نەبێت وەکو سامی و حامیەکان کۆچیان بۆ کردبێت. ئا کادیەکان بەمانەیان ئەوت(کاشو) ئەم کاشوانە ئەوانەن کە کتێبی پیرۆز بە((گۆش)) یان ناو ئەبا. لە ناوەراستی سەدەی هەژدەهەمی پێش میلاد دا ئەم کاسیانە وڵاتی بابلیان گرت و لە وڵاتی سومرو ئاکاد دا حکومەتێکیان بە ناوی (کاردونیاش)ەوە دامەزراند کە نزیکەی شەش سەد ساڵ ژیا، لە پاش تێکچونی حکومەتەکەیان دیسان گەڕانەوە بۆ کێوەکانی زاگرۆس (لوڕستانی) ئێستە. لە دەوری حکومەتی ئەخمینیەکانا برایەتیەکی باش لە بەینی ئەم کاسیانە و حکومەتی ئێران(ئەخمینی)دا پەیدا بو، هەروەها ئەسکەندەریش شەڕێکی زۆری لەگەڵ کردن،(انتیفونوس) سەرداری بەناوبانگی رومانی لە(پردی تەنك– گەلی)یەوەکە کەوتبوە وڵاتی ئەمان بەناویان تێ پەڕی. کەوابوو رون بوەوە کە قەومی کاسی لە سەرەتای میلاد دا لە لوڕستانی ئێستەدا هەبوو، دورنیە ریشەی لووڕەکانی ئێستەش بن.

***4–(خالدی– ئورارتو)*** وا ئەچێتە دڵەوە کە ئەم قەومە لە سەردەمێکا لەرۆژهەڵاتی ئاسیای بچوکەوە هاتونەتە هەرێمی دەریای (وان). لە گێڕانەوەی ئاشوری بە تایبەتی لە بەڵگەی شەڕەکانی (سەرگۆن)ی دوهەم پادشای ئاشوردا دەرئەکەوێ کە سنوری دەوڵەتی (خلدی)سەردەمێك لە شیمالەوە پاڵی ئەدا بە دەریای(گوگجە)و (الکسندرپول)لە قەوقاس، لە جنوبەوە

بە(رواندن)و سەرچاوەکانی روباری(زاب). لە رۆژاواوە بە روباری(فورات) و لە رۆژهەڵاتەوە بە دەریای(ورمێ)یەوە. سەردەمێکێش فەرمانیان بە سەر شیمالی سوریەدا ئەکرد و پایتەختیان شاری(توسپاسی وان) بو کەوا گومان ئەکرێ (ساردوریس)ی یەکەم پادشای خلدی لە(840)ی پێش میلاد بەهۆی دەسەڵاتی مێدیەکانەوە و بەهۆی نیشتەجێ بونی ئەرمەن لەرۆژهەڵاتی وڵاتی خالدیەوە ئەمانە بڕانەوە و تیاچون(کامبریک: تاریخی کۆن. بەرگ3).



*5-(سوباری)* یەکەم جار کە ئەم ناوە بینراوەتەوە لە روی پارچە لەوحێکی کۆنەوە بووە کە دەوری حکومەتی(لوگال- ئانی-موندو) پیشان ئەدا کە لە چەرخی (30) هەمی پێش میلاد فەرمان رەوایی‌یان کردوە و زیاتر لەسەر شێوەی وشەی(سوپیر) کەوتۆتە بەرچاو. ئەم بەڵگانە کە بۆ دەوری (نارام سین) ئەگەڕێنەوە لەسەر شکڵی (سوپایتم)پیشانی ئەدەن وە ئەم وشەیەش مانعایەکی جغرافی بووە بۆ ئەو وڵاتە کە لە سیمالی غەربی عێلامەوە دەست پێ ئەکا تا وڵاتی (ئامانوس) لە پاشا بو بە ناو بۆ هەندێ قەوم وەکو وشەی (حامورابی)چۆن بو بە ناو بۆ قەومێکی سەربەخۆی ئازاد. ئەم سوباریانە دەورێکی زۆریان بە شەڕ لەگەڵ ئاشوریەکانا گێڕا. بەڵام لە ئاخر دەوری ئاشوریەکانا ناوی ئەم سوباریانە ون بو و ناوی(نایری) شوێنی ئەمانی گرتەوە کە ئەم نایریانەش قەومێکی تر بون.

***(ب) دەستەی دوهەم:*** میدی‌یەکان و بەردەستەکانیان:

(هوڤی رونبص) و (هنری پریستید) دو مێژونوسی بەناو بانگن ئەڵێن: ئەو قەومە دراوسێیانە کە جنسەکەیان گەلێك، لێك نزیکە هەندێ جار بە (ئاری) ناو ئەبرێن. ئەمانە پەلێکن لە قەومەکانی(هیندو- ئاوروپی) کە لە دەورو بەری (2500) ساڵ پێش میلاد لە وڵاتەکانی رۆژهەڵات و شیمالی رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین دائەنیشتن. ئەمانە هەندێکیان بە کشتو کاڵەوە خەریك بون بەڵام بە تێکرا هەر وەکو لە دەوری بەردین دا بن وانە مەگەر هەندێکی کەمیان نەبێت کە گەیشتونەتە دەروی (کانی- معدنی). بێجگە لەوە کە مەڕو ماڵاتیان بەخێو ئەکرد لە باری تریشدا کەمەکێك هەر پێش کەوتبووە. لە ماڵاتا ئەسپیان زۆر پێ خۆش بو، بەڵام نوسین هەر فێر نەبون(پرستید. لاپەڕە 171 و پاش ئەوەش). هەندێ لەم ئاریانە چون بۆ هیند لەوێدا کتێبێکی پیرۆزیان بە زمانی(سانسکریتی)پێکەوە ناو ناویان نا(ڤیداس). ئەم کتێبە لە لایەن ژیانی سەرەتایی ئەمانەوە ئاگاداری باشی تێدا هەیە. هەروەها هەندێکی تر لەم ئاری‌یانە رویان کردە رۆژئاوای جنوبی و دەشتی(رافدین) و لەوێدا مانەوە، دو شەعبەکەی(ماد- مێد) و(پارس- پارسای) لە هەرە بەهێزی ئەم دەستەی دوهەمەن. هەروەها (پریستید))ئەڵێت: ناونانی (هیندو- ئەوروپی) بە ئاری هەڵەیەکی زلەکە تا ئێستە بڵاوبۆتەوە، راستیەکەی ئەوەیە ئەو وشەیە کە(ئێران- ئێرانی)) لێوەرگیراوە بەسەر عەشایری شاخەکانی ئێراندا بوترێ، ئەو عەشایرانە کە بەشێکن لەو قەومانە کە هیندو ئاوروپییان بەسەر بڕاوە.

*1-((مید))* : ئەم قەومە لە قەومەکانی((هیندو- ئاورپی)ن، واتە (ئاری). لە سەدەی نۆهەمی پێش میلاد لە رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین (وڵاتی باختریانە) و چونەتە رۆژاوای شیمالی کێوەکانی ئێران، واتە وڵاتی (میدیا) وردە وردە دەسەڵاتیان بەسەر دراوسێکانیشیان پەیدا کردوە، لە دوایی هاتنی سەدەی هەشتەمی پێش میلاد دا حکومەتێکی سەربەخۆیان دامەزراند قەومی(پارسای)

شیان خستە ژێر دەست خۆیان و شاری(هکمتان) (هەمەدانی کۆن) یان دروست کردو کردیان بە پایتەخت.

ماموستا(سایس) ئەڵێ: مێدیەکان ئەو عەشایرە کوردانە بون کە لە رۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشور دائەنیشن و سنوری خاکەکەیان تا جنوبی دەریای قەزوین ئەڕۆیشت. زۆرتر ئەم قەومە لەلایەن لوغەت و زمانەوە ئەچونەوە سەر(هێند- ئەروپی)و لەلایەن رەگەزەوە ئەچونەوە سەر (ئاری) . وەکو هەندێ لە رۆژهەڵاتی ناسەکان ئەڵێن، زمانی مێدی ئەم زامانی کوردی ئێستەیە بووە. وە یا ئەم لوغەتی کوردییە بناغە بووە بۆ ئەو (ئێران قدیم).

هەندێکی تر لە زاناکانی مێژو ئەڵێن: لە پاش بڕانەوەی دەوڵەتی مێدی هەندێکیان بە تەواوی وەر گەڕانە سەر قەومی(پارس- فارس) هەندێکیشیان لەبەر دراوسێتی لەگەڵ قەومی کوردا بون بە کورد. بەپێی ئەم قسەیە شەعبی(پارثی) یش لەبەرئەوە تێکڵاوی دو شەعبەی کوردو فارس بون ئەوانیش لە ناو ئەوانا تیا چون. ئەم نزیکیەش کەئێستە لە مەعبەینی کوردی و فارسیدا ئەبینرێت ئەوە سۆراخێکە لە تێکڵاو بونی ئەو دو شەعبە ئارییە کە(مێدی)و (پارثی)ن.(القضیة الکردستانیة والترك لاپەڕە 21).

((سیرولسن))یش ئەڵێت: (کوردەکان لەنەتەوەی مێدییەکانن)) بەپێی ئەمانە شەعبی مێدی سەرچاوەیەکی زۆر نزیکەی لەم دەستەی دوهەمەدا بۆ قەومی کورد.

***2-(نایری- نەهری)***ئەم قەومە لە پێش ئاخر کۆچە کەیانا لە کوردوستان دائەنیشتن، راستە بەڵگە کۆنەکان شتێك لەمانەوە ناڵێن. بێجگە لەهی دەوری ئاشوریەکان کە گۆیا ئەمانەی مەبەستە. وا دەرئەکەوێت ئەم عەشرەتە لە دەوری گەلێ کۆنەوە دو قەومەکەی (سوبارو) و(گوتو)ی دروست کردوە. ئەو گوند و عەشرەتانە کە ئێستە لە ناوچەی(نیری- نەهری) دان لە وڵاتی (شەمدینان) دورنیە لە پاشماوەی (ئەم (نایری)یانە بن،(مینورسکی) وەکو(تورودانگین)ی رۆژهەڵاتی ناس ئەڵێت: ناوچەی (نایری) یا(هوبشکیا) ئەمە شیو و دۆڵەکانی (بۆتان)ە و ئەم بەشی رۆژهەڵاتی نایریە لە وەختی خۆیا دەوڵەتێکی سەر بە خۆیان دروست کردوە.

(میجەرسۆن) ئەڵێت: ئەگەر تەماشایەکی دەوری(گۆتی) یەکان بکەین کە لەبەینی سەدەکانی (15و 12)ی پێش میلاد دا ئەژیان ئەبینین ئەم نایریانە- کە پێش مێدیەکان کەوتبون- لە کوردستانی ناوەراستدا ژیانێکی باشیان ئەکرد و دەسەڵاتێکی واشیان هەبو کە ترسو لە رزیان خستبوە دڵی دراوسێکانیانەوە. هەر ئەم قەومە بو لە پاشا ناوەکەی گۆڕا بو بە(کورد). ئەم وڵاتی نایریە لە دەورەدا لە حەوزی ناوەڕاست لە روباری زابی گەورەوە دەستی پێ ئەکرد تا سەرچاوەی روبارەکە. مێدییەکان کە حکومەتەکەیان تیاچو بەرە بەرە رویان کردە ئەم شوێنە و ئێرەیان ئاوەدان کردەوە).

***3-(کارد خوی):*** لێرەدا دوبیر و باوەڕ بەرامبەر بەم قەومە- کە (گەزەنەفون) لە گەڕانەوەی (10) هەزار کەسەکەیدا لە(401) پێش میلاد توشیان بووە- هەیە. یەکەم وشەی (کارد خوی) وشەی (گوتی) کۆنە وە بە هۆی دور کەوتنەوەی زەمانەوە تێکچوە بووە بە کارد خوی، تەنانەت بە هۆی ئەم دور کەوتنەوە لە دەوری (توکولتی-تیراری) پادشای ئاشور بە(کوتی) و(کورتی) ناو ئەبرا. لە لێکدانەوەکەی رۆژهەڵاتی ناس(درایڤر) وا دەر ئەکەوێ ئەم هەمو وشە و ناوانە چە(کورتی)چە(کاردا)- کە دو قەوم بوون لە دەوری (ئاراد- نانار) پادشای(لاگاش)- هەمو هەر ناو بوون بو ئەم شەعبی کوردی ئێستەیە و زەمان گۆڕیونی. ئەگەر ئەم قسەی وا بێ ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە کاردخویەکان پاشماوەی گۆتیەکانی کۆنن و هیچی تر.

دوهەم ئەم شەعبی کاردخویە دور نیە ئەو وەختە هاتبێتنە کوردوستان کە مێدی و فارسەکان کەوتونەتە شوێنەکانی خۆیان و تیایانا نیشتەجێ بوون و یا لە پاش ئەم وەختە بووە کە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش میلاد ئەگرێتەوە، کە هاتویشن وردە وردە دەسەڵاتیان بەسەر عەشایرەکانی کوردستاندا پەیدا کردوەو لە پاشا بوون بەیەك. ئەم قسەشە ئەچێتە دڵەوە زۆر نزیکە ئەمانە رویان کردبێتە کێوەکانی ئێران و تیایا نیشتەجێ بوبێتن، بۆیەش نزیکە چونکە عەشایرێکی زۆری کورد لە دەوری ساسانیەکانا لە ئێراندا هەبوون وەکو( سیر سیدنی سمیث) یش ئەڵێت: کە ئەم عەشایرانە لوغەتی تایبەتی خۆیانیان هەبووە و سەربەخۆ بوە، هیچ پەیوەندێکی بەسەر لوغەتی فارسیەوە نەبووە، چونکە ئەم کۆنترە لە فارس.

لە سەر باوەڕی یەکەم ئەم کاردخوییانە لە نەتەوەی ئەو گۆتییانەن کە وڵاتی سومرو ئاکادیان داگیر کرد و لە قەومەکانی زاگرۆسەوە سەرەو خوار بونەتەوە. لە سەر باوەڕی دوهەم لە رەگەزی (هیندو- ئاوروپی)دائەنرێن هەروەکو مێدی و فارسەکان، بێجگە لەمەش لەمەعبەینی ئەو عەشرەتانەدا کە شەعبی کوردییان پێك هێناوە هەندێك هۆزیان تێدا هەیە کە بەڵگەکانی کۆن باسیان ئەکات وەکو ئەوەی ماموستا(اولمستید)ئەڵێت: تیرەیەك هەبون پیان ئەوتن(موسری) ئەمانە ریشەی ئەم عەشرەتی (موسری- مزوری) ئێستەن، هەنوکەش وەکو دەورەی (سناخریب) لە لێواری روباری(خازر) دائەنیشن.

خولاسە کورد لە نەتەوەی دەستەی یەکەم بێت، واتە، قەومەکانی زاگرۆس بن کە سەرچاوەکەیان قەوقاسیە و لەپاشا بە هۆی لافاوی

کۆچ کردنەوە لە دو سەدەی هەشتەم و نۆهەمی پێش میلاد بوون بە ئاری؟ و یاهەر راستەوخۆ لە نەتەوەی دەستەی دوهەم بن، واتە، ئاریەکی بێخەوش (هیندو– ئاوروپی) وەکو زۆرتر لە مێژو نوسەکان هەر وا ئەڵێن. ئەوی گومانی تێدا نەبێت ئەوەیە: بیروباوەڕەکەی دەستەی یەکەم کە: (کورد قەومێکی زۆر کۆنە) ئەمەیان باوەڕێکی بە هێزە لەگەڵ ئەوەش هێشتا هەر بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە پێویستە بە هەندێ لێکۆڵینەوەی تر!.

(امین زکی بەگ) ئەڵێت: (لەگەڵ ئەو باوەڕەشدا: کە ئەڵێت کورد لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش میلادەوە هاتونەتە کوردوستان من لام وایە باوەڕێکی قایم نیە، بە پێچەوانەی قسەکەی مامۆستا (سپایزر)و خەڵکی تریش کە ئەڵێن سەرچاوەی کورد ئەو دانیشتوە ئەسڵیانەن کە لە کێوەکانی زاگرۆس و یا هەر ئەو دانیشتوە کۆنانەن کە لە کوردوستاندا دانیشتبون، ئەم باوەڕە بە هێزەو زۆرتر ئەچێتە دڵەوە).

دیسان(امین زکی بەگ) قسەی رۆژهەڵاتی ناسەکان و (سپایزر)یش ئەخاتە ناواخنی باوەڕی خوێ و ئەڵێت: (ئەمە راستە کە کورد لە سەر زمانی قەومەکانی تر گەلێ ناوی هەیە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەریەکە ناوی قەومێك بووە جیا بووە لەویتر بەڵکو لەوانەیە بەپێی زەمان هەر قەومە، کە هاتوە ناوی(کورد)ی بە شتێك بردوە، وەکو ئەوە کە سومریەکان پێیان ئەوتن: (گوتی، جوتی، جودی). ئاشوری و ئارامیەکان ئەیانوت: (گۆتی، کوتی، کورتی، کارتی، کاردو، کارداکا، کاردان، کارکتان، کارداك). ئێرانیەکان ئەیانوت: (کورتیو، سیرتی، کوردراها). یونان و رومان پێیان ئەوتن: (کاردوسوی، کاردوخوی، کاردوك، کردوکی، کردوخی، کاردویکای). ئەرمەن ئەیانوت: (کوردوئین، کورچیخ، کورتیخ، کرخی، کورخی). عەرەبیش ئەیانوت: کردی، کاردوی، باکاردا، کارتاویە، جوردی، جودی).

سەیر ئەکەی ئەم هەموو ناو و گۆڕانە لە پاشەرۆکی تەبێعەتی شێوەی قەومەکانەوە بووە نەوەك لەبەرئەوە کە ئەمانە چەند قەومێکی جیاجیاو عەشایری تێکلاو پێکلاو بوبێتن. تەنانەت ئەم ناو گۆڕانە ئێستەش هەر هەیە وەکو ئەوە کە عەرەب ئەڵێت ((بندقیە))، لاتین ئەلێ(ڤینیسیا)، تورك ئەلێ(وەندیك). هەر وەها وشەی (ماد)پارسیەکان(مادا)ئاشوری(ئامادا)، یونان(مد)ی پێ ئەڵێن.

هەروەها هەندێکی تر لە رۆژهەڵاتی ناسەکان ئەڵێن: (ئەم هەمو ناوە کە بۆ کورد هەیە و نەبێت هیچیان لە هیچیانەوە دروبن بەڵکو هەمویان لێکەوە نزیك و پێکەوە بەستراون، جا یا بەهەمو قەومی کوردا وتراوە و یا هەر یەکە بۆ عەشرەتێك وتراوە، چونکە کورد گشتی عەشایر بوە و زۆر زۆریش بوون).

هەندێکی تر لە رۆژهەڵاتی ناسەکان ئەڵێن: شەعبی کوردی لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش میلادەوە هاتونەتە کوردوستان.

ئەگەر ئەم قسەیە راست بێت دو خراپە ڕوی تێ دەکات! یەکەم ئەمانە کە کۆچیان کردو هاتنە کوردوستان چۆن جێ نشین بون؟ دوهەم چۆن توانیان قەومی نیشتەجێ شوێنە کە بخەنە ژێر دەست خۆیان؟ لە کاتێکا کە ئەم وڵاتی کوردوستانە رێی نەکەوتوە چۆڵ بێت هەتا وەکو قەومێکی لابەلایی بێت و بە ئاسانی بتوانێ تیایا دانیشێ!.

(امین زکی بەگ)ئەڵێت: لەسەر باوەڕی من ئەتوانین خراپەی یەکەم بەوە لابەرین بڵێین ئەمانە کە لەو تاریخەدا هاتونەتە کوردوستانەوە پاشماوەی ئەوانە بوون کە زوتر هاتبوون، ئەمان کە هاتن لەبەرئەوە کە لەگەڵ هینەکانی پێشودا خزمایەتیان هەبو بە سوك و ئاسانی رێی کەوتن. ئەگەر ئەم باوەڕە وەربگرین خێرا ئەوەمان ئەچێتە دڵەوە کە سەرچاوەی قەومی کورد(گۆتی، لوللو، کاسای، مید، نایری) بووە، بەڵام لابردنی خراپەی دوهەم نەختێ گرانە چونکە نەخشەی (اسنوغرافی)قەومە کۆنەکان کە لەکتێبی رۆژهەڵاتی ناس و پسپۆڕەکان بەرچاومان ئەکەوێت شوێنی (کوردوئین) یا(کاردویکای)یەکانمان پیشان ئەدا کە گۆیا ئەوانەی قەومێکی تازەهاتوون و لەناوچەیەکی بچوکدان. لەمانەش وەکو نەخشەکەی ((سیرمارك سایکس))– کە سەدەی شەشەمی پێش میلاد پیشان ئەدا– ئەلێ: ئەم ناوچەیە لە بەینی (دیار بەکر) و سەرچاوەکانی زابی گەوردەدایە کە پانی و درێژیەکەی تا(188)پێش. م. هەر وەکو خۆی مابوەوە!.

نەخشەی بەرگ 3 کتێبەکەی(کامبریك: تاریخی کۆن)) چۆنیەتی سەدەی شەشەمی پێش میلاد دەرئەخا ئەڵێت: ناوچەی ((کوردوئین)) لە روباری (بطمان)ەوە بۆ تا جنوبی دەریاچەی ((ورمێ))– کە ئەمە وڵاتی بۆتان و شیمالی کێوی جودی ئەگرێتەوە– کەچی ئەو ناوچەیە کە پێ ئەڵێن(کوردوئین)) دەیەکی ئەو وڵاتە نابێت کە قەومە کۆنەکانی کوردوستان داگیریان کردبو!. خۆ ئەگەر بڵێین قەومی(کوردوئین)) زۆر بچوك بوون جا قەومێك ئەوەندە بچوك بوبێت چۆن ئەتوانێ لە ماوەی دو چەرخ و نیودا زاڵ ببێ بەسەر ئەو هەمو قەومانەدا کە لە خاکی کوردوستانابون؟ لەگەڵ ئەوەش ئەبینین دەوڵەتێکی وەکو ئاشور چەند جار لەگەڵ ئەم قەومانەدا جەنگی کردەو هیچی بە هیچ نەکردوە!.

دیسان((گەزەنەفون)) خۆی ئەڵێت: (لەو کاتەدا کە لە ئاشوریە گەڕامەوە بۆ تەرابزون توشی پەلاماری کردوئینەکان بوم). ئەم قسەیە ئەوەمان بۆ دەر ئەخا کە قەومی کورد لە ئاخری سەدەی پێنجەمی پێش میلاد وە نەبێت تەنها هەر ئەو ناوچە بچوکەی داگیر کردبێت کە کەوتۆتە جنوبی(وان))ەوە. بەڵکو هەر لە سەرچاوەی زابی گەورەوە داگیری کردوە تا ئەگاتە لێواری دەریای رەش. دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەوە کە شەعبی کوردی وە نەبێت شەعبێکی تازە بوبێتن و هاتبێتنە کوردوستانەوە بەڵکو لە پێش

سەدەی حەوتەمی پێش میلادیشەوە هەر لەوێ بوون بەڵام بە ناوێکی تر ناویان بردون[1]).

تا ئەم شوێنە بیرو باوەڕی هەندێ لە رۆژهەڵاتی ناس و مێژو نوسەکان بۆ بەرامبەر بە کورد بەریشەی کورد، ئینجا هەندێکی دیکە بەجۆرێکی دیکە بۆی چوون هەر چەندە هەر یەك ئەگرێتەوە بەڵام بۆ ئەوە باسەکە بگا بە ئەنجام ناچارین قسەی ئەوانیتریش بخەینە بەرچاو چونکە هیچیان خاڵی نین لە قازانج:

دوکتۆر (کونتناو))ی فەرەنسی ئەڵێت: (لەدەورو بەری هەزارەی چوارەمی پێش میلاد سەرەتا، یەکەم لێشاوێکی کۆچ کردوەکان کە هاتونەتە کێوەکانی زاگرۆسەوە سەرەتای لافاوەکەیان وا دەر ئەکەوێت لە جنوبی دەشتی((سیبریەو روسیە))و بو بێت. زاناکان ناوی ئەم قەومەیان بە(ئازیانیك– ئاسیای)داناوە بۆ ئەوە لە کۆچ کردوەکانی تریان جیابکەنەوە. لە هەزارەی سێیەمی پێش میلاد دیسان دەستەیەکی تر هەر لەو شوێنە کۆچیان کردو هاتنە کێوەکانی زاگرۆس و بەناوی(ئاری) یا (هیندو– ئاوروپی) ناوبانگیان دەرکرد. ئەمانەی تازە لەگەڵ دانیشتوەکانی پێشودا لە پاش شەڕو شۆڕێکی زۆر رێی کەوتن و ئینجا وڵاتی(بین النهرین) یشیان داگیر کرد. ئەم پەلامارەی ئەمان ئەوەیە کە لە بەڵگەکانی(بین النهرین) دا بە پەلاماری(گۆتی)و(کاسی) ناوی ئەبا.

لەلایەن کۆچکردنی دەستەی دوهەم کە (ئاری)یا(هیندو– ئاوروپی)بێ دیسان دوکتۆر(کونتناو) ئەڵێ: (لەناوەندی مەرکەزییەوە (دوو)هاتن هی دوو دەستە پێ کرد، یەکێکی روی کردە رۆژاواو چووە ئاوروپاوە، دەستەکەی کەش ناوچی جنوبی بالقانی گرتەوەو چوە(یونان)ەوە).

جا ئێستە ئەگەر شوێن قسەی ئەو زانایانە بکەوین کە ئەڵێن(ماد)و (پارس)ە کان لە هەزارەی دەهەمی پێش میلادەوە هاتونەتە رۆژاوای ئێران– کە زاگرۆسە– ناچارین کە بڵێن لە پێش ئەوانیشا دیسان ئارییەکانی هیند– ئاوروپی کۆچێکی تریان بۆ ئەم وڵاتە هەر کردوە، چونکە لە زمانی کاسیەکانا رەگەزی هیندو ئاوروپی ئەبینرێ وەکو لە ناوی خواکان و پادشاکانیان دەرئەکەوێ. گەلێکی تر لەو زانایانە کە لە شتیان کۆڵیوەتەوە ئەڵێن: هاتنی ئەم هیندو ئاوروپیانە بۆ ئاسیای بچوك لە گۆشەی شماڵی رۆژهەڵاتەوە بووە، واتە لە دەربەندی قەفقازەوە – کە کورتتر رێگەیەکە لە بەینی ئاسیای بچوك و وڵاتەکەی ئەوانا– دەستە زانایەکی تر ئەڵێن: (( نەخێر ئەمانە بە((بسفور))دا هاتونەتە ئاسیای بچوکەوە، ئەمە ئەو رێگەیەیە کە لەپاشا((گالات))ە کان پیایا هاتن)).

ئەو شتانە کە قسە لە قەومی زاگرۆسەوە بکات لە هەمویان کۆنتر بەڵگەی((سارگون)) پادشای(ئاکادە)ە – کە لە (530 تا 475)پێش میلاد پادشایەتی(ئاکاد)– جنوبی بین النهرینی– کردو چو بۆ جەنگی زاگرۆس. لە پاش داگیر کردنی وڵاتی ((کازالو)) کە لە رۆژهەڵاتی دجلەوە بو– چو بۆ ناوچەی –(بەدرە)– کە ئەو سەردەمە(در) یان پێ ئەوت–. گرتنی بەدرە رێی بۆ کردەوە بۆ ئەوە بچێت بۆ (ئیلام، لوڕستان و کوردوستان). لە نوسراوەکەی سارگۆندا ناوی ئەم شوێنانەو ناوی(لوبدو) کە لە وڵاتی کەرکوکدا بووەو هی وڵاتی (لولوبیوم)و (گوتیوم)) هەموی هەیە. کە سارگون بەسەر چو لەم ئاکادانە چەند پادشایەکی تر هاتنە ناوەوە بەڵام لە ئاخرا ئەرکی وڵاتەکەیان پێ بەڕێوە نەبرا تا گەیشتە (نارام سین). لێرەدا زاگرۆسیەکان ویستیان سەر لەژێر فەرمانی بپێچێتەوە، نارام سین هەستا لە پێشا وڵاتی (کازالو) و(بەدرە)ی داگیر کردو چو بۆ دەوروبەری (ئاڵتون کوپری)بۆ گرتنی دەوڵەتی(شیموروم) ناوی ئەم دەوڵەتەش لە پارچە لەوحی پادشاکانی ((ئوور))دا بینراوە.

(لولوبی)یا(لولو)کە بە پاپیرە گەورەی (لوڕ) دائەنرێن. ئەمانە قەومێك بون کە لە((زەهاو، شارەزوو و سولەیمانی، دائەنیشتن، کۆنتر شتێك لە لایەن ئەمانەوە کە بەرچاو کەوێت نوسراوەکەی (نارام سین)ە کە لە دەوروبەری (2500)ساڵ پێش میلاد نوسراوەتەوە. بەپێ قسەی (ژ. دومرکان)(شوتروك ناحونتە) پادشای هەرە بەدەستی ئەمانە لە(1200)ی پێش میلاد بەردە کۆنەکەی لە شاری((سیپ– پاری))ەوە((شوش))و باسی سەرکەوتنی خۆی بە زمانی ئیلامی تێدا نوسیوەکە چۆن بەسەر لولوبیە کانا زاڵ بوەو تایفەی تریشی خستۆتە ژێر دەست خۆی؟ لولوبیەکان لە زەهاو شارەزورو سولەیمانیەوە هەموو دەم ئەچون رێبازی کاروانی بابلیە کانیان ئەگرت و رێگەی بەینی کفری، کەرکوك و ئاڵتۆن کوپریش هەر بە دەست خۆیانەوە بوو.

ناوی کۆنی زەهاو(پادیر)بووە، ئەم شوێنە جێگەی هەڵکەندنی نەخشەی بەناوبانگ(انوبانی‌نی)بوە. حاکمەکانی(لولوبی) لەدەوری (نارام سین) دا لە گەروی قەرەداغ جەنگێکیان لەگەڵ لە شکرەکەی کردو نارام سین شکاندنی، سەرگوزەشتی ئەم سەرکەوتنەی خۆی لە داوێنی گەورەکەوە لە سەر بەردێك هەڵکەندوە. شوێنی ئەم دەربەندی (گەور– گاور)ە لە گەلی قەرەداغە نزیك بە گوندی(سێوسێنان).

<u>*(گوتی))–*</u> نارام سین لەگەڵ گوتی یەکانا– کە ئەمانیش یەکێکی ترن لە قەومەکانی زاگرۆس– کەوتە شەڕەوە و بەدەست ئەمان شکستی هێنا، ئەم گوتی‌یانە لە شیمال و رۆژهەڵاتی شارەزوردا بون. کە نارام سینیان شکاند پەلاماری لولوبیەکانیشیان دا،

---

1 بێجگە لەوە کە خۆم تەماشای زۆرتر لە قسەی رۆژهەڵاتی ناسەکانیشم کردوە، لە سەرەتای قسەکەی مینورسکیەوە کە لە دائره المعارفی ئیسلامیدا باسی کردوە تا ئەم شوێنە لە(خولاسەی تاریخی کوردو کوردستان)ی امین زکی بەگەوە وەرگیراوە.

هەرچەندە ئەوانیشیان شکاند بەڵام لەبەرئەوە لە خۆیان بایی بوبون لە ئاخردا هەر لە شارەزورا بەهۆی یەکێ لە نەوەکانی نارام سینەوە شکانێکی پیسیان بەسەرهات.

کە ئەم گوتییانە کەوتنە(بین الهنرین)خەڵکی شوێنە کە زۆریان بێز لێ ئەهاتنەوە، لەمانەش ئێجگار بابلیەکان چونکە ئەوان خۆیان بە قانون زان و شارستانی ئەزانی ئەیانوت ئەم گوتییانە دەشتەکین!. دورنیە چونی ئەم گوتییانە بۆ(بین النهرین)لەبەرئەوە بو بێت کە هیندو ئاورووپییەکان لە شیمال و رۆژهەڵاتەوە پاڵیان پێوە نابن. گوتییەکان لە پاش (125) ساڵ دەستیان لە بابل بەرەڵا بو لە پاشا لە ناوچەی زاگرۆسدا بون بە دەرەبەگی و هەر کەس بۆ خۆی، وەکو ئەوە لە شیمالەوە لە نزیك زاگرۆس(ئوربیلوم) هەولێری ئێستە بو بە دەوڵەتێك، لە جنوبی هەولێر دەوڵەتی(شیموروم) ئاڵتون کوپری پەیدا بو، لە جنوبی ئەویشەوە دەوڵەتێکی تر هەبو بە ناوی (هارش) کە توزخورماتوی ئێستەیە!.

*((کاسی))*یەکێکی دیکە لە قەومەکانی زاگرۆس کاسیەکانن کە لە شیمالی ئێلامەوە چونەتە(بین النهرین)، لە دەوروبەری(2400) ساڵ پێش میلاد بەڵگەیان لەم شیمالی ئێلامەوە بەجێ هێشتوە. زاناکان زمانی ئەم کاسیانەیان بە یەکێ لە زمانەکانی قەوقاسی داناوە. مەبەست بە قەوقاسیش زمانی دانیشتوی کێوەکانی زاگرۆسە، هی ئەو دەورەیان کە گومانێك لە ئاری بونیان نییە. لەگەڵ شتدا ئەم کاسیانە ئاشنایەتی فیکرییان لەگەڵ قەومەکانی هیندو ئاورووپیدا بووە، وەکو ئەوە کە (ئەسپ)یان پەرستوەو بە تیشکی خوایان زانیوە. ئەم بڕوایە بڕوای قەومەکانی هیندو ئاورووپی بوە، بەپێچەوانەی بابلیەکان ئەمانە گوێیان بەم جۆرە فیکرانە نەداوە.

یەکێك لە سۆراخی دەسەڵاتی هیندو ئاورووپی بەسەر کاسیەکانا، وشەی(بوکاش- بوغاش)ە کە بەمانا خوایە. ئەم وشەیە لە زمانی ئەسلاوەکانا(بوگو- بغو)، لە هی(فروگی- فریژی)یەکانا (باگایو)، لە فارسی کۆندا (بوغ) بوە، کە ئەم بناغە لە وشەی (بەغدا)و (بغپور)و(ئازەر فروغ بوغ)دا هەر دیارەو ماوەتەوە. لە لەقبی پادشکانی ساسانیدا بە مانای خواو خواوەندگار هاتووە. یەکێ لە پادشاکانی(کاسی)ناوی(اندا بوگاش)بووە کە بەشی یەکەمی ئەم وشەیە زاگرۆسی و بەشی دوهەمەکەشی(بوگاش)ە کە بەمانا خوایە.

لە سەرەتای باسەکەی(دوکتۆر کونتناو)ەوە تا ئەم شوێنە مەبەستمان هەر ئەوە بو کە بەپێ ئەو شتانە کە لە بەڵگەکانی بابل و ئێلام و ئاددا دەست ئەکەوێ چۆنیەتی دانیشتوانی کێوەکانی زاگرۆسمان بۆ دەرئەکەوێ. ئەوەندەمان بۆ دەرکەوت کە لە هەزارەی سێیەمی پێش میلاد و بەڵکو پێشتریش قەومێك لەم کێوانەدا ژیاون کە زمان و ئایین و ڕەوشتێکی سەیریان بووە، بەڵام کەس بناغەی ڕەچەڵەکە کەیان تێ نەگەیشتوە. ئەوەندە هەیە بەپێ ئەم زمانە کە ئێستە هەیە دەرکەوتووە کە (سامی) نەبوون، ئیتر ئایاکێ؟ و لە بەرچی لەو شوێنە دورە دەستی ئاسیاوە هاتونەتە ئەم کێوانە؟

ئەمەیان تۆزێ ونە. هەندێ لە زاناکان بە (ئازیانێك)یان داناون، هەندێکی تر بە(ئاری)، لە پاشا لەبەر ئەوەی کە هێشتا بەڵگەیەکی ڕێکو وپێکیان لە بارەیانا چنگ نەکەوتوە پییان وتون (قەوقاسی)،واتە دانیشتوانی ئەو کێوانە کە سەرەکانیان ئەگەنەوە قەوقاس، بەڵام چاکتر ئەوەیە کە هەر ناوبنرێن بە قەومی زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس. واتە: مەردمی دانیشتوانی ئەم کێوانە.

***

ئەوانەی لە مێژوی کۆنیان کۆڵیوەتەوە بۆیان دەر کەوتوە کە یەکێ لەهۆی هەرە بەهێزی کۆچکردنی قەومێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەوە بو کە لە پشتەوە پاڵەپەستە نراون و ناچار بون بە کۆچکردن و بۆ پێشەوە رویشتن. بەتایبەتی لە باسی کاسیەکانا ئەم تەخمینە زۆرتر ئەخرێتە کار، چونکە لە دەورەی ئەوانا قەومێکی تازە لە زاگرۆس پەیدا بون پیان ئەوتن(هیندو- ئاورووپی). ئەمانە لە سەرەتای هەزارە دوەهەمی پێش میلاد لە دەشتەکانی تورکستان و شیوو دۆڵەکانی شیمالی قەوقاس و دەریای خەزەرەوە هەستان و هاتنە زاگرۆسەوەو بون بەدو بەشەوە.

بەشێکیان رویان نا بۆ جنوبی رۆژهەڵات و و چونە(هیند)ەوە و دانیشتوەکانی ئەوێیان خستە ژێر دەست خۆیان و زمانێکی تازەیان بڵاو کردەوەو ناویان نا(سانسکریتی)، بەشەکەی تریان- کە تۆزێ بچوکتر بون- ڕێگەی رۆژئاوای زاگرۆسیان گرت و لە هەوارگەی کاسیەکان نزیك بونەوەو لەگەڵ ئەوانا بەجۆرێك تێکلاو بون کە پەرستنی(سوریا- خوای هەتاو)و (ماروت- تاعون)و(بوریا- خوای تۆفان) لێیانەوە فێر بوون. هەروەها ئەوەشیان لە زاگرۆسیەکانەوە وەرگرت کە لە باتی (گا)و (کەر) کەڵك لە (ئەسپ)ببینن، چونکە ئەم بۆ جەنگ بەکەڵکترە[1].)

رۆژهەڵاتی ناسی بەناوبانگ (مێجەر سون)یش لە سەر باسی ئەم چۆنیەتی کوردە بیرو باوەڕێکی هەیە، لەبەر ئەوە خاڵی لەکەڵك لێوەرگرتن نیە بە کورتی و کوتکراوەی قسەکانی ئەویش ئەخەینە پێش چاوکە ئەڵێت:

((مەبەست بە وڵاتی (نایری) تەنیا شیمالی روباری زابی سەرونیە، بەڵکو ئەوەیە کە (تیگلات پلیسر) و نەتەوەکانی ناویان بۆ دانابون ئەیانوت: نایری ئەو قەومەن کە لە دەوروبەری سەرچاوەکانی دجلە و فوراتدا دائەنیشن و لە شمالی (نیفاتس)واتە(دیار بەکر، خەرپوت، درسم) وکێوەکانی(بتلیس)و (توروس) دا رائەبوێرن کە ئەم وڵاتانە لە(401)ی پێش میلاد (کوردوئی) یەکانی تێدا بینراوە و تیایانا دانیشتبوون.

---

[1] تا ئەم شوێنە ناو بەناو لە کتێبی(کورد)ی مامۆستا(رشید باسمی)ش وەرگیراوە

له و تاریخەوه ئیتر کوردوستان بووه به نیشتمانی قەومێکی کۆنی دەست لێنەدراو و خاوەن زمانێکی سەربەخۆ. بەڵگەی ئەم قەسەیەشمان ئەوەیە: ئەو سەردەمە کە قەومە ئاریەکان کۆچیان کردو شوێنەکانی خۆیانیان بەجێ هێشت و رویان کردە(فارس) و (میدیا) و هەندێ شوێنی ئاوروپا، قەومی کوردیش شوێنەکەی خۆی بەجێ هێشت و روی کردە کێوەکانی کوردوستان کردیان بە شوێنی خۆیان. تەنانەت ئێستە ئێمە– کە قەومی ئینگلیزین و لە نەتەوەی سەکسۆنین– لە باو باپیرمانا لەگەڵ کورددا یەك ئەگرینەوە و ئەبین بە خزم. خوێنی قەومی کورد تێکڵاوی خوێنی هیچ قەومێکی تر نەبوە، رەگەزو خوێنی خۆی لە هەموو دەورێکا پاراستوەو هەمو دەم هۆشی بە زمانەکەی خۆیەوە بوە، نەیهێشتوە هیچی تری تێکڵاو ببێت. کە دو حکومەتی (مێدی)و (فورس) دواییان هات و فارس کەوتە ژێر دەست (پرس– ئەشکانی)یەکانەوە میدیەکان پەنایان بردە کێوەکان و بەناوی(کوردوئی)واتە(کوردی) ناونراون، ئیتر تاریخیان بەم ناوەوە ناسرا.

کە تەماشایەکی لاپەڕەی شیمالی رۆژاوای ئاسیا بکەین ئەبینین هەموو دەم لەبەر ئاشوری، فارس، یونان، رومان، عەرەب، مەغول و تورك شوێنی ئاژاوەو خوێن رشتن بووە. ئەبینین کە وەستان و بەربەرەکانێ کردنی قەومی کورد بۆ ئەمانە لە بەربەرەکانێ کردنی هەمو شەعبێکی تر زیاتر بوە و هەمو دەم کۆششی ئەوەیان کردوە کە خوێن و رەگەز و زمانەکەیان بە پاك و پوختی بهێڵنەوە، لە راستیدا ئەم رەوشتەی کە کورد هەیبوە کەس ناتوانێ ئینکاری بکا.)) هەروەها میجەر سون ئەڵێت:

((ئەم کێوو دەشتانە کە کەوتونەتە شیمالی رێگەی(رەها– موصل)ەوە لە بەرەبەیانی تاریخەوە شوێنی ئادەمیزاد بون، سنورێکی تەبێعی و سیاسی بون کە شیمالی(بين النهرين)ی لە جنوبی جیاکردونەوە. ئەمەش بەوەدا ئەیزانین کە لە(1100) لە دەوری پادشایەتی (تیگلات پلیسر)دا کێوی(تورعابدین) کە ئەوە وەختە پیان ئەوت( نیفات) بو بو بەسنوری شیمالی وڵاتی ئاشور. لە پشت ئەم سنورەوە وڵاتی(نایری) بو کە هەمو جار تیگلات پلیسر کۆششی داگیر کردنی ئەکرد. لە پاشا ناوی وڵاتی (نایری) بوبە(کوردوئی) کە ئەمە راست (کوردین) یا(کورد)ئەگرێتەوە. لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە قەومی کورد لە بەرەبەیانی مێژوەوە رەگەزەکەی ئاریە هاتونەتە ئەم وڵاتە.

دیسان وەکو لاپەڕەی تاریخ پیشانمان ئەدا لە شکری گەلێ لە قەومە گەورەکانی وەکو یونان، ڕۆمان و پرس هەمو دەم ناچار بون بەوە کە لەبەردەم ئەم کێوانەوەو لەبەر سەربزێوی دانیشتوەکانی روبکەنە دەشتەکانی جنوب، چونکە هەر ئەم کێوانە پیشانمان ئەدەن کە لوتی گەلێ لە قەومەکانی رۆژهەڵاتیان شکاندوە لەو کاتەدا کە ویستویانە شاڵاویان بۆ بەرن. تەنها قەومی ئاشوری یەکەم قەوم بوە کە توانیبێتی بچێتە وڵاتی(نایری) یا(کوردو ئئین) ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە دانیشتوانی ئەم شوێنە لە قەومی ئێستەی کورد پاشکەوتوتر بوون بۆ ئارەزوکردنی سەربەخۆیی و ئازادی. قەومە بە هێزە داگیرکەرەکان لە ڕەوڕەوی تەئریخدا گەلێکیان کۆشش کردوە بۆ ئەوە کە ئەم قەومی کوردە بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. بە راستی چۆن تەقەلاکەی ئەوان بۆ ئەم ئامانجە پیاو ئەخاتە بەلاجەوییەوە مل نەدان و بەر بەرکانیەکەی ئەمان گەلێ گەلێ پیاو سەر سام تر ئەکات. بێجگە لەمەش هەر ئەم کوردە لە روپەڕەی رۆژگاردا زۆرشتی وایان بەجێ هێشتوە کە رۆژهەڵاتی– ناس و مێژو نوسەکانیان هەمو جار بە خۆیانەوە خەریك کردوە!.

کورد سەر بۆ کەس دانانەوێنی و مل کەچی کەس نابێ، هەمو دەم حەز بە بەرزبونەوەو پێشکەوتن ئەکات، بستە زەوییەکی بە خۆڕایی نا دۆڕێنی، زۆر زۆر بێزی لە رەوشتی ئەو قەومانە هاتۆتەوە کە ویستویانە داگیریان کەن، بۆ ئەوە کە ئاگاداریی کە یانی قەومی و زمانی ئاری خاوێنی خۆیان بکەن، و سوڕانەوەیان لە شاخ و چیای وڵاتەکەی خۆیان پێ خۆش بووە. جا، قەومی وا دوایی نایەت و دوایی پێ ناهێنرێت.))

تا ئەم شوێنە کە ئێمە درێژەمان بەم باسە دا هەمو قسەی ئەو مێژو نوسانە، یا ئەو رۆژهەڵاتی ناسانە بو کە لەبەر چۆنیەتی سەرچاوەی کورد ناچار بوبون بە باسکردنی غەیری کوردیش، کەم و زۆرێك قسەکانمان هێنان و نوسیمانن، هەر یەکە لەرێگەیەکەوە بۆی چوون هەر یەکە قسەیەکیان لێوە کردەوە لەهەندێ شوێنا کە گۆیا زۆر روناکیان کردبێتەوە ئەو کوردانە کە ئیمڕۆژو ئەو رۆژەش هەر بە کورد ئەناسرێن و ناسراون ئەوان جیایانیان کردۆتەوە بەناوی(گۆران) لە کوردیانیان داپچڕیون!.هەروەها هەندێکی تری وەکو مامۆستا(رشید باسەمی) لەبەر ئەوە کە خۆیان کورد بوون زۆر بە دڵسۆزی قسەیان لێوە کردوە و خۆیانیان پێوە خەریك کردوە، بەڵام لەبەر ئەوە کە ئارەزویان لێ بوە کورد بکەن بە نەتەوەی ئێرانی– یا هەر بە ئێرانی– هێناویانە بە قسەی رواڵەت رەنگین باسەکەی خۆیانیان رازاندۆتەوەو لە ناوەندی باسە کە دا ئەڵێن: (چە دوژمنایەتیەك لەمە گەورەترەکە کورد لە نەتەوەی جەمشید و فەریدون زەردەشت و کورش و داریوش لابدەن و بیانکەن بە رۆڵەی (لاسیراب)و(ئانری داپی زیر) ی گوتی، یا(تیگلات پلیسر)و(سارگون)ی ئاشوری و... هتد.)

ئێمە نازانین جەمشید و لاسیراب یا کورش و سارگون– کە هەر یەك لەمانە لاپەڕەی خۆیانیان پڕ کردۆتەوە و رۆیشتون– چییان بۆ ئێمە بەجێ هێشت؟. چە شارستانی و بناغەیەکیان بۆ بەجێ هێشتین کە ئیمرۆژ ئێمە لە ناویا رابوێرین؟. چەدارێکیان بۆ ناشتین کە ئێستە لە سێبەریا بحەسێنەوە؟ ئەم بێ یا ئەو بۆ ئیمرۆژی ئێمە

هیچ جیاوازییەکی نیە. قسەیەکی کوردی هەیە ئەڵێت: ((نان ئەو نانە ئیمڕۆ لە خوانە.)) جا، نا چارین بڵێن ئا ئەو کەسانە کەوا بو کۆششە کەیان بۆ ئەوە بووە کە کورد بکەن بە نەتەوەی ئێرانی و هیچی تر ئەوەندە هەیە ئێمە- وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین- ئەتوانین ئەوە بچێتە دڵمانەوە کە (پارس) لە نەتەوەی کوردە، نەوەك کورد لە هی پارس دیارە ئەم دو قسەیە جیاییکی زۆر لە بەینیانا هەیە.

دیسان هەر ئەو کەسانە ئەڵێن: (هەندێ کەس لە سەر زەوی ئێراندا قەومێك دروست ئەکەن و کورد ئەبەنەوە سەر ئەو قەومە). ئێمەش ئەڵێین: ئەو قەومە کە ئەو ، لای وایە دروست ئەکرێت! چار نیە ئەبێت پارسیش هەر ببرێتەوە سەر ئەو قەومە. کە ئەمەمان وت لام وایە ئەوانە ئیتر دان بەوەدا ئەنێن بڵێن( ئەو قەومە کە تائێستە ئێمە ئەمانوت فەرزکراون وا نیە، بەڵکو هەر لەراستیدا هەبوون و هیچ دروست کراونین). ئەمە ئەمان، ئینجا قسەیەکیش لە رۆژهەڵاتی ناسەکانەوە بکەین:

بەڵی ڕاستە رۆژهەڵاتی ناسەکان خزمەتێکی زۆری مەردمیان کردوە بە تایبەتی خزمەتیان بەرامبەر بە ئێمە لەلایەن رەگەز و زمانەوە شایانی سوپاسە، ئێمە ئەمەمان لەبیر ناچێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش زۆر گرانەو پیاو لە زمانێکی غەیری زمانەکەی خۆیدا هەر چەندە شارەزا بێت و ببێ بە وەستا تیایا هەر وەکو کوڕی ئەو زمانەی  لێ نایە، چونکە گەلێ نهێنی هەیە مەگەر بە زەوقی خاوەن زمان و بە پەروەردە کردنی زەمانی منداڵی ئاشکرا ببێ و بزانرێ ئەگینە بۆ یەکێکی تر نەوەك زۆر گرانە بەڵکو هەر هەڵناهێنرێت.

جا ئەو کەسانەی کە بێگانە بوون و لە کوردیان کۆڵیوەتەوە یا گەڕۆکێکی رواڵەت دەروێش بوون و لە بابەت کاروانەکەی خۆیانەوە شتێکیان نوسیوەو ناوی کوردیشیان تێ خستوە، یا رۆژهەڵات ناسێك بوون کە ویستویانە باسی شوێنان لە باری عیلمی و ئابورییەکی هێمندا بکەن بۆ ئەوە کە دەست بدا پاشەرۆژ قەومەکەی خۆیان لە باری ئابوریدا کەڵك لە قسەکانیان وەربگرن، یاخود کابرانە گەڕۆکێکی هەردەگەڕ و نەعالمێکی پایە بەرز بووە، بەڵکو خۆی لە خۆیەوە بۆ هەر شتە و بۆ هەر شوێنە شتێکی روبازاڕی بینیوە و لەسەری رۆیشتوە و ئیتر نەیتوانیوە  بە تەواوی لێ بکۆڵێتەوە. جا ئێمە سەیری هەر کام لەم سێ کەسە بکەین ئەبینین ئەو شتەی وتویانە، یا نوسیویانە- بەتایبەتی کابرای یەکەم و سێهەم- و نەبێت سەرەنجامێك بدەن بەدەستەوە و یاشعورێکی ساق بەرامبەر بەو شوێنە بنوێنن. ئەوەندە هەیە دەستەی دوهەم- ە رۆژهەڵاتی ناسەکانن- لەبەر ئەوە ئامانجێکی عیلمییان لە گەڵا هەبوە قسەکانیان زیاتر جێ باوەڕەو خاڵی لە کەڵك لێوەرگرتن نییە. کەوا بو قسەی ئەمانەیان- با لەسەدا دەیشی شوێنی خۆی بێت- پیاو ئەتوانێت شتی لێدەربێنێت، بەو بۆنەیەوە ئێمەش هاتین لە باسکردنی سەرچاوەی کورددا ئەو رۆژهەڵاتی ناسانە کە قسەیان لێوە کردوە زۆرتر قسەکانیانمان هێناو نوسیمانن، بەڵام هێشتا بە پوختی نەگەیشتینە مەبەست. ئینجا منیش ئەمەوێ بیروباوەڕی خۆم بە ئاشکرا بەبێ لایەنگری لەباری کوردو سەرچاوەی کورددا دەر بڕم بۆ ئەوە ئەم گەنجینەیە هەروا بە قوفڵ لێدراوی نەمێنێتەوە.

من ناڵێم بیرو باوەڕەکەم لە سەدا سەد راستە، بۆیە ناڵێم چونکە ئادەمیزاد خاڵی نییە لە هەڵە و لە کەم فیکری، قسەکانی منیش فیکرێکە لە روی بەراوردی هەندێ فیکری ترەوە دەرم بڕیوە، زۆر نزیکە چەوتی تێدا هەبێ، ئامادەم بۆ بەرەنگار بون، بەڵام بە نوسین نەوەك بەقسەی روتی گوێی ئاگردان، چونکە شت کە نوسرا لە ئاخرا راستە کە دەر ئەکەوێ، لە پاش خۆیشم هیوادارم رۆڵەکانی کورد ئەگەر ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە من لە بیروباوەڕەکانما بە هەڵدا چووم بە چاوی لێ بوردون لێم ئەبورن و راستیەکی راستتر ئەخەنە بەرچاوی نەتەوەکەیان.

***

لە پێش کردنەوەی باسەکەدا پێویستە ئەوە بڵێن کە هەندێ کەس ئەڵێن: کۆنتر خاکێك کە ئادەمیزادی تێدا کۆبوەتەوە(خوزستان- ئیلام)و(بين النهرين). جارێ(زاگرۆس)- کە شوێن و مەڵبەندی کوردە- و ئیمرۆژ کەوتۆتە رۆژاوای ئێران و رۆژهەڵاتی تورکیاو شیمالی عیراقەوە لەبەرئەوە لە وەختی خۆیدا شوێنێکی بەپیت بووە دانیشتوانی وڵاتی بابل و ئاکادو سومر چونکە وڵاتەکەی خۆیان بی خێرو بێر و بوە و ویستویانە زاگرۆسیەکان بخەنە ژێر چنگ خۆیان بۆ ئەوە لە پیتی وڵاتەکەیان کەڵك وەرگرن، بەم بۆنەوە هەمو دەمێك لە چنگە پرچێدا بوون. گەلێ جار ناوی دانیشتوەکانی زاگرۆس وەکو (گوتی، کاسی، ئامادا و پارسوا) لە نوسراوەکانی ئەوانا بەرچاو ئەکەوێت.

لە لایەن بناغەی نەژادی ئەمانەوەی زاناکان ئەبن بە دو بەشەوە بەشێکیان ئەڵێن هەندێ لە مانە وەکو(ئامادا و پارسوا) بەبێ قسە(ئاری)ن بەشێکیان ئەڵێن ئاری بونی هەندێ لەمانە وەکو(گوتی و کاسی) تۆزی وردبوونەوەی ئەوێ. جا لەبەر ئەوە کە ئەم دو بڕوایە لە بینیانا بوە ناوی ئەمانەیان هەمو ناوە(قەوقاسی)، گۆیا لە زەمانێکی زۆر کۆنەوە لە کێوەکانی قەوقاس و زاگرۆس ماونەتەوەو ژیاون. دیسان دەستەیەکی تر پێیان ئەڵێن(ئازیانیك) مەبەست لەم هەموو قسانەش هەر ئەو قەومەیە کە لە زەمانی پێش تاریخ پێش پەیدا بونی ئارییەوە لە یەکێ لە شوێنەکانی ئاسیاوە کۆچیان کردوەو چونەتە کێوەکانی زاگرۆس. سەرەڕای ئەوە کە ئەگونجا ئاریش بن بەڵام تا بەڵگەیەکی قایم نەبێت ئێستە هەر لەژێر ناوی (قەوقاسی)یا(ئازیانێك) یا(قەومەکانی زاگرۆس)دا ناوی ئەبەین.

سەرچاوەی مێژوی تێکڕای ئادەمیزاد زۆر تاریکە، بەپێی بەردو شتومەکەکان کە دو هەزار ساڵێك پێش میلاد کەتونەتە بەرچاو لەدەوری شارستانی یەکەمی ئادەمیزاد تاقی کراونەتەوە گۆیا

دوسـەد هـەزار سـاڵە ئـادەمیزاد لەسـەر زەوی پەیـدا بـووە، و بگـرە هەندێك ئەڵێن نیو ملیۆن ساڵە. رەگەزی كە ئەوەنـدە سـاڵ لـەتۆپێكی وەك و زەوییەوە پەیدا بو بێت ئایا چە ئەقڵو زمانێك ئەتوانێ دان بەوەدا بنـێ كـە سەرچاوەی رون بكاتـەوە؟. یا ئـەم خـاك و ئیـسقانە لێك بكاتەوە كە هەموو بستە زەویـەك دور نییە بە مێشكی هـەزاران كەس پربوێتەوە و لەگەڵیا تێكلاو بوبێـت؟! لەگـەڵ ئـەوەش خوێنـدن و خوێندنەوە لە ناویانا زیاتر لە (6) هەزار ساڵ نیە.

كـەوا بـو هـەر قـەومێك یـا هـەر نـەژادێك بیـەوێ شـوێنی زۆر كـۆنی باوباپیری خـۆی یـا قـەومێكی تـر رون بكاتـەوە بێجگـە لـە تـەخمین و بـەراوردێكی ئـەقڵی ناتوانـێ بـە بەڵگەیـەكی ئاشـكرا بـەم ئامانجـەی خۆی بگا، بەڵكو هەر دەمێكی بۆ بەرێ لە ناراستیەوە گـەڵێ نزیكترە لە راستی. بەم بۆنەوە ئێمەو غەیری ئێمە لـە بابـەت رەگـەز و نـەژادی كـوردەوە– و بڕگـە غـەیری كوردیشـەوە– نـاتوانین لـە(3500) سـاڵ پـێش میلاد بـەولا تـرەوە بڕوێن. دیسـان دور نیـە ئـەم ژمارەشـە هـەر خاڵی نەبێت لە تەخمین.



بە نەژادو خوێن و رەوشت و عەنعەنات ساغ بوەتـەوە كـە (كـورد) قـەومێكی (ئـاری)یـەو (سـامی)نیـە– (ئـاری، لـە ئاریاسـەوە هـاتوە. بـەمانا بـرادەرە)– عالمـە نـەژاد شناسـەكانی ئاوروپـا وەكـو(ئـوژن پیتـار)و (سـولاك)و(ڤـون لوشـان) گـەلێك بـەم باسـەوە خۆیـان خـەریك كـردوەو لێیان كۆڵیوەتـەوە. ئەمێنیتـەوە سـەر ئـەوە ئایـا سەرچـاوەی ئەم ئاریيانە سەرەتا لە كوێدا بووەو لە كوێ وە هاتوە؟ بۆ ئـەم باسـە وردبونـەوە یـەكی وردو قـوڵی ئـەوێ. جـا بـەوە بۆنـەوە لـەپاش موتالایەكی زۆرو پشكنینی كەلێن و قوژبنی گەلێ شوێن ئەوەمان بۆ دەركەوت كە:

***ئاریـەكان*** لـە(3500)سـاڵ پـێش مـیلادەوە لـە جنـوبی روسـیاوە بەسـەر شـیماڵی قـەوقاس و دەریـای رەشـدا بـەرەو خـوار بونەتـەوەو هـاتون بـۆ دەوروبـەری رۆژاوای ئـاسیا. دور نیـە ئـەم كۆچـكردنەیان لەبەر بێ لەوەڕی بۆ ماڵاتیـان و زۆر بونی ژمارەی خۆیان بوو بێت كە ئیتر لەوێدا جێیان نەبو بێتـەوە. هـەر كە بزوتون هاتون بوون بـە دو بەشـەوە، بەشێكیان رویـان كـردە ئاوروپـاو قـەومـەكانی ئـەوێ لێ دروسـت بـوە، بەشـێكیان هـەر لـە دەشـتەكانی جنـوبی روسـیاوە هاتونەتـە رۆژاوای ناوەراست و رۆژاوای نزیكیـەوە تا جنوبی هینـد چون. . ئەم بەشەیان كە بەرەو ئاسیا بونەوە لە توركستانی ئیمڕۆی روسیادا خۆیان گرتەوەو ماوەی هەزار ساڵێك مانەوە لە پاشا رویـان كردە جنوبی ئێران، ماوەیەكی باشیش لێرەدا مانـەوە ئینجا بـون بـە دوو رێچـكەوە، رێچـكە یـەكیان بەسـەر هیمالایـادا چـۆن بـۆ هینـدو لە(پەنجاب)ی ئێستە گیرسانەوە و نەتەوەی هیندییان دروست كـرد، رێچكەكەی تریان بە ناوبانی ئێراندا بڵاوبونـەوەو بـە ئێرانـی ناویـان دەركرد، دورنیە هاتنی ئەمانە بۆ ئێران (2500)ساڵێك پێش میلاد بگرێتەوە[2].

ئـەم رێچـكەی دوهەمـە پـەرەی سـەندو زۆر بـون هەنـدێكیان لـە دەشتەكانی ئێراندا جێگیربون و بە(پارس)ی ناسران، هەندێكیشیان بە رەوشتی كۆچەرایەتی كەوتنە شاخەكانی زاگرۆس و وەكو ئەو شاخانە پـەل پـەل بونـەوەو (لولـو، گـۆتی، كاسـی، مانـای، كاردوش، خالـدی، كاردوهـاو مـاد) یـان لـیّ پێك هـات و هـەر یەكـە بـۆ خۆیـان دەورێكیـان گێڕا، هەرچەندە بە ژیانی كۆچەرایەتی مابونـەوە بـەڵام دەوری حكومەتایـەتیان بـاش هەڵئەسـوڕان، تەنانـەت گـەڵێ جـاریش پەلاماری دەشتەكانی ئێران و وڵاتی ئاشوریشیان ئەدا. دورنیـە ئـەم تیرەی(لولو)یە سەرەتا بە(لولو)ناویـان دەر كردبێـت و لـە پاشا بـەرە بەرە ناوەكەیان گۆرابێ تا هاتۆتـە سـەر(ماد). مەبەسـت بـە كۆچـەری لێرەدا تەنیا ئەوەیە كە دانیشتوی كێوەكان بوون، چونكە ئەوانـەی لە دەشتەكانی ئێرانا مانـەوە ورده ورده نیشتەجێ بـون و لـە شـارو لادێ كانـا دامــەزران وەكــو بەرچـاومان ئەكــەوێ ئــەم رێچــكەی دوهەمـەش بـوون بـە دو بەشـەوە، قەومەكانی زاگـرۆس، دانیشـتوی دەشـــتەكانی ئێـــران. لـــە نـــاو هینـــەكانی دەشـــتی ئێرانا(پارس)هەڵكەوت– كە هەخامەنشیەكان ئەچنەوە سـەر ئـەوان– لــە ناوهینەكــەی زاگرۆسیشــدا (مــاد)هەڵكــەوت– كــە كوردەكــان ئەچنەوە سەر ئەوان[3].

مادەكـان دەوڵـەتێكی زۆر بـە دەسـەڵاتیان هـەبوە، تەنانـەت لـە دەرەوەی (هوەخشـەترە) دوهـەم پادشای بەهێزی ماد پارسـەكان بـە

[2] لـە سـەرتای بزوتنــەوە ئـەم ئاریانــەوە تـا ئێـرە معـالی مامۆسـتا (توفیـق وهبـی) بـەگ كـە زانایـەكی كوردەو ئێستە لـە بەغدادایـە ئـەویش لەسەر ئەم باوەرەیە.

[3] تا ئێستە علمانی نەژاد شناس لەسـەر ئەوەبون كە ئەم قسانە لێرەدا هینامانن ئاخر لێكۆڵینەوەیـەك بوە كە پێگەیشتون، كەچی كوتوپرر لـە مارتی 1951 دا لاپەرەی تاریخ بەجۆرێكی تر گۆررا" كوتوپرر رۆژهـەڵاتی نـاس پروفیسـۆر(كـارلتون كـن) مامۆسـتای دانشـگای (پەنسـیلوانیا) لـە ئەمەریكا– كە بۆ گەڕان و لێكۆڵینەوە چوبوە ناوبانی ئێرا– لە ئەشكەوتی (كەمەربەند) لـە(بەشـەهر) لەشیماڵی ئێران ئیسكوپروسكی كەللە سـەری ئادەمیزادێكی دۆزیەوە وەوای بۆ دەركەوت كە ئەمە هی ئادەمیزادی سـەد هەزار ساڵ لەمەوپێش پێشترە !.

ئـەم كەللـە سـەرە هـەر لاشـەویلگەیەكی بـە ئەنـدازەی كەللـە سـەری ئادەمیزادێكی ئێستە ئەبو وە هەر ددانێكی دو ئینچ ئەبو.

بێ گومان ئادەمیزاد هێشتا زۆری ماوە بگا بەسەرچاوەی حەقیقەت وەیا بگا بە سەرچاوەی تاریخی خۆی!. چۆن ئەگا؟ علما بۆیان دەركـەوتوە كە ئەو هێزی نە شونما و راكێشان و كارەباییە كە لە رۆژدایە ئەرزی راگرتوە و بـەخێوی ئـەكا وە بۆیـان دەركـەوتوە كـە گـەڵێ ملیـۆن سـاڵە ئـەرز هەیـە هێشتا ئەو هێزی رۆژە نەگەیشتوتە نیوەیی!...

تەواوی کەوتنە ژێر چنگی ئەمانەوە، بەڵام کە هەخامەنشیەکان هاتنە کایەوە ئیتر دەوڵەتی ماد ئەو دەسەڵاتەیان نەماو رویان کردە کزی.

ئێستە مەبەست ئەوە نیە حکومەت هەبوە یا نەبوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە لە پاش لەناو چونی حکومەتی ماد و نەبێت شەعبەکە لەناو چوبێت، بەڵکو ئەو شەعبە بەرە بە بەرە هەر مایەوە و خۆی پاراست و بە دەور و بەر کێوەکانی زاگرۆسدا بڵاو بوەوە تا گەیشتە سەر وکوردی ئێمڕۆژ. کەوابو دەرکەوت کە(کورد) لە نەتەوەی (ماد)ە و(ماد)یش قەومێکی ئاری بوون. ئەگەر لەم ڕێگەوە بۆی بچین ئەوا قەومی کورد لە باپیرە گەورەیانەوە لەگەڵ قەومی فارسدا یەکیان گرتەوەو وەکو لەگەڵ هی هینددا بون بەیەك. خۆ ئەگەر لە ڕێگەیەکی ترەوە بۆی بچین ئەڵێن:

سەرەتا کە ئارییەکان  لە کلکەی شاخەکانی قەوقاسەوە هاتن بەم دیوا ئەو بەشەیان کە ڕوی کردە هیند ئەوان لەوێ بون بە هیندی، بەشەکەی تریان کە لە کێوەکانی زاگرۆس مانەوە لە پاش ئەوە کە ماوەیەك بە ژیانی کۆچەرایەتی رایانبوارد وردە وردە هەندێکیان رویان کردە دەشتەکانی ئێران و لەوێدا نیشتەجێ بون و دەستیان کرد بە شار دروست کردن و بون بە شاریو بەرەبەرە، رەورەوەی تاریخ رەنگی ژیانی گۆڕین و قەومی فارسی لیٚ پێك هات. لە سەر ئەم قسەیە کورد بناغەیە بۆ فارس و فارس ئەسڵەکەی کوردە، جا ئیتر تیرە تیرە بونەوە و لەمان لولوو کاسی و ماد پێکهات و لەوان پارس و هەخامەنشی و ساسانی دروست بۆ ئەمە شتێکی ترە. ئەوەندە هەیە فارسەکان بەهۆی نیشتەجێ بونیان لە لادێ و شارەکاناو هەڵسوکەوت و قسە تێکڵاو کردنیان بە غەیری قەومی خۆیانەوە- کە ئەمە لە پێویستی تەبێعەتی شارنشینیە- زمانە راستەقینەکەی خۆیانیان گەلێك تێك داوەو ئێستە بەجۆرێ قەسە ئەکەن بە دەگمەن ئەچێتەوە سەر شێوەی پارسی و مێدی کۆن- کە ئەمانە ریشەی هەر دو زمانەکەن- . بەڵام کوردەکان لەبەر ڕێی کەوتی مەڵبەندی و کۆچەرایەتی و شاخنشینی دورتر بوون لە قەومی بێگانەوە، کەمتر تێکلاویان بووە بە تێکلاو بونێکی وەها کە کاربکەنە سەر تێکدانی زمانەکەیان-مەگەر لە دەوری ئیسلامیدا نەبێ کە هەندێ وشەی عەرەبی بەهۆی ئاشنایەتی ئایینەوە تیٚ کەوت- بەم جۆرە بەبێ تێکدان و دەست لێدان زمانەکەی خۆیانیان پاراست و هێشتەوە، ئەوانە کە سەر روشتە و زانیارییان لە لایەن زمان ناسینەوە هەیە بە ئاشکرایەکی زۆر ئاشکرا ئەزانن کە زمانی کوردی چاکتر و پوختەتر ئەگونجێ لەگەڵ زمانی با پیرە گەورەکانیانا کە مادو پارسە، بە تایەبتی لەگەڵ سانسکریتی و کتێبەکەی زەردەشتدا.

ئەمێنێتەوە سەر ئەوە هەندێ کەس لە زاناکانی رۆژاوا کە لە قەومی کوردیان کۆڵیوەتەوە باوەڕێکی تریان دەر بڕیوەو وتویانە: (لە وڵاتی کوردەکان هەندێك هەن وەکو لوڕ، هەورامی و.. هتد. ئەمانە لە رەگەزی کوردنین و پیان ناڵێن کورد، بەڵکو ئەمانە (گۆران)ن!) ئەم قسەیە ئەوەندەی تر پیاو لە باوەڕی ئەو زانایانە ئەخاتە سەرسامییەوە! چونکە ئایا بەچی؟ و لە کویٚ ئەمەیان بۆ دەرکەوت. ئایا بەچی قسەکەی خۆیانیان بردە سەر کە ئەمانە قەومێکی غەیری ئاری و میدی بوون و لە دەورێکی زۆر کۆنەوە هاتون لەوڵاتی کوردەکانا نیشتەجیٚ  بوون؟ بیٚ گومان لەوەڵامی ئەم پرسیارە لام وایە یا بیٚ دەنگی یا بی هێزی پرسیار ئەبیٚ لە وەڵامیان !.. جا بۆ ئەوە چە ئەوان و چە ئەو کەسانەش کە ئەکەونە شوێن ئەم فیکرەی ئەوان بە تەواوی ئەم باوەڕیان لەدڵ دەرچیٚ و لیٚ پەشیمان ببنەوە ئەڵێن:

بێجگە لەوە ئەگەر ئەو کەسانە کە پسپۆرن لە نەژادشناسیدا بێن و بە تەواوی لە خوێن و ئەندام و جمگەو چاوو موی ئەمانە- کە ئەوان پێیان ئەڵێن گۆران و بە غەیری کوردیان  دەرئەکەن- وردببنەوە و سەیریان بکەن- وەکو کردویانە- لەڕوی یاسایەکی عیلمیەوە هاوار ئەکەن کە ئەمانە کوردن و لەگەڵ رەگەزی کورددا چە لە کۆن چە لە تازەدا هیچ جیاوازیکیان نیە و زمان و ریشەی زمانەکەشیان هەر یەکە، دیسان بێجگە لەم قسەیەش من خۆم لەم باوەڕەدام و ئەڵێم:

ئەمانە کە ئەوان پێیان ئەڵێن(گۆران) و لە کوردیان جیا ئەکەنەوە هەر کوردن و هیچ جیاوازیەك لە بەینیانا نییە، ئەوەندە هەیە پەیدا بونی ئەم ناوە بۆیان هەر کوردەکان خۆیان لەبەرە بەیانی ژیانی کۆچەرایەتیانەوە بۆیان داناون و تا ئێستە ماوەتەوە. ئەمەش بەم جۆرە:

لەناو قەومی کورددا بە تێکڕا ئەم رەوشتە بوەو هەیە: کە (کورد بەو کوردانە ئەڵێن کە دەوارنشین و کۆچەرین و ((گۆران))یش بە کوردانە ئەڵێن کە شارنشین لادێی نشینن. لە سەردەمێکا کە نیشتەجێیەتی لە کورددا نەبوە بوە ئەم ناوەش نەبووە، لە پاشا وردە وردە ئەو بەشەیان کە دەستیان دا بە دانیشتن لە شارو لادێکانا بەشە کۆچەریەکان ناوی (گۆران)یان بۆ دانان، و ئەم وشەیە من لام وایە بناغەکەی وشەی (گۆڕان)ە، لەبەر ئەوە زۆر کەوتۆتە سەر زمانەوە بوە بە(گۆران) گۆیا بەشی کۆچەریەکە لەبەر ئەوە بەشەکەی تر پیشان لە ژیانی کۆچەرایەتی هەڵکرد پیان وتن(گۆڕان)یانیٚ لەسەر ڕێی و شوێنی ئێمە لایان دا. ئەم باوە کە تێکڕای کورد بە کۆچەری ئەڵێت(کورد) تەنانەت لەلای عەرەبیش هەر باوە کە تێکڕای عەرەب بە کۆچەریەکانیان ئەڵێن عەرەب، ئەگەر بەپێی قسەی ئەو زانایانە بیٚ وشەی(عەرەب)بۆ ئەو عەرەبە دەشتەکیانە ئەو مەعنا کە لە وشەکە وەرگیرێت ئەبوایە نەیدا بە دەستەوە و یا بە لادێی نشین و شارنشیەنەکانیان نەوتایە(عەرەب) لەگەڵ ئەوەش وا نییە.

مەسەلەی جیاوازی هەندێ لە شێوەی قسەکردنی ئەم کورد و گۆڕانانەش ئەمە و نەبێت ئەوە پیشان بدا کە رەگەزەکەیان جیایە،

بەڵكو ئەمە پێشهاتی دانیشتن و كۆچەرایەتی و ناوچەی قسە كردنە كە ئەمە لە هەموو قەومێكدا ئەم جیاوازیە كەمە لە بەینی شێوەی قسەكردنی دانیشتوەكانیاندا ئەبینرێ، نەوەك هەر لە بەینی كۆچەری و نیشتەجێدا، بەڵكو لە بەینی شێوەی قسەكردنی بە تەنیشت یەكەوە یا دو شار، بگرە لە هەندێ شوێنا لە بەینی دو گەڕەك لە شارێكدا و لە قەومێكدا ئەبینرێت. دەی ئایا ئەكرێت ئەم جیاوازی شێوەیە لە بەینی ئەو دو گەڕەكە یا ئەو دو گوندە دا بكرێتە هۆی جیاوازی ڕەگەزەكەیان؟!.

دیسان بۆ زیادە ئاگاداری بیرو باوەڕی چەند كەسێكی تر لە مێژو نوسەكان لە لایەن ئەوەوە كە (كورد)لە نەتەوەی (ماد)ەكانن بەكورتی ئەنوسین:

1-(أ-سۆن)) لەبەرئەوە ئاشنایەتیەكی زۆر هەیە لە بەینی زمانی ئێستەی كورد و زمانی میدیە كانا- ئەو زمانەیان كە زەردەشت كتێبەكەی خۆی پێ نوسیەوە- لای وایە میدیەكان كورد بون.

2-مامۆستا((سایس)ئەڵێت میدیەكان كورد بون و لە قەومە ئاریەكانن چەبە ڕەگەز چە بە زمان، وڵاتەكەیان كەوتبوە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوری و تا جنوبی دەریای قەزوین ئەڕویشت.

3-(حسن پیرنیا- مشیر الدولە))لە كتێبەكەیا(ئێرانی كۆن) ئەڵێت: لوغەتی میدی ئەگەر زمانی كوردی ئێستە نەبێت بناغەیەتی.

4-(دائرە المعارفی بریتانی ساڵی 1929)ئەڵێت: مادەكان كە دەوڵەتەكەیان تیاچو تێكلاوی كوردەكان بون و بون بە كورد.

5-كتێبێك لە باری قەومەكانی هیند و جرمانی ئاسیەویەوە لە 1934 لەلایەن(هانس كونتر)ەوە دەرچوە ئەڵێت: (كوردەكان لە مادەكانن و ئەمانە هەندێكیشیان فارس بون و هەر بون بەكورد)هەر لەسەر چاوەی ئەم كتێبەوە دانراوێكی فەرەنسزی هەیە كە هی (زیوروفسكی)یەو كتێبە كە(قەوقاس و قەوقاسیەكان)ە. لە وێدا ئەڵێت: (كوردەكان لە نەتەوەی میدیەكانن).

6-(لوشان)ئەڵێت: (كوردەكان لە جنسی سپی پێستەكانن، میدی و فارسەكانی ئەوەڵ پیشان ئەدەن و لە ئەوروپی شیمالیەوە هاتون. سەختی وڵاتەكەیان پاراستونی و هەمو نیشانەیەكی ئاریەتیان تیاماوە و بە خۆیانیان ئەوت(ئارین). كە لەگەڵ فارسەكان بون بە یەك، واتە كە (كورش)وڵاتەكەیانی گرت ئەو وەختە هەستیان ئەكرد بە شعوری قەومی و ئەڵهای كەیانێكی ئازادیان ئەكرد).

**وشەی كورد**

ئەوە بو لە لاپەڕەی (30)دا وترا وشەی (كاردخوی)وشەی (گوتی)كۆنە و دوركەتنەوەی زەمان وای لێ كردوە، تەنانەت سەر دەمێك بەم(كاردخوی)یانە ئەوترا(كوتی)و(كورتی) ئەمەشیان بۆ دەركەوت كە (گۆتی)یەكان یەكێك بون لەقەومەكانی زاگرۆس. (استرابون)ی یۆنانی كە لە باسی(ئاتروپات- ماد)كانا قسە لە وڵاتەكەیانەوە ئەكات ئەڵێت: (شمالی وڵاتەكەیان وڵاتێكی كوێستانەو هەندێ قەومی كوێستانی تێدا وەكو(كادوسی، ئەمردەكان، تابورەكان و كورتەكان). مەبەست بەم(كورت) انە (كارد خوی)یە

دیسان یۆنانیەكان هەمو دەم بە دانیشتوی وڵاتی(بوتان)و (دورگەی ابن عمر) یان ئەوت(كردو خوی)، گۆیا وشەی (خوی) بەلای ئەرمەنیەكانەوە بۆ(جمع)بوو وشەكە بە تەنیا(كردو)ە. بەپێی قسەی(مینورسكی)لە ئینسایگولۆپیدیای ئیسلامدا مێژو نوسەكانی یونانی ئەم ناوەیان لە كابرایەكی ئەرمەنی بیستوە لەو وەختەدا كە (تیگران)ی دوهەم پادشای ئەرمەنستان لە سەدەی یەكەمی پێش میلاد دا وڵاتی(كردو خوی)گرت و پادشاكەی كوشت، و لە(115)ی پاش میلاد ئەمیرێك لە(كردوئن)راست بوەوە. ئەوەندە هەیە سەر كەوتنی ئەرمەنیەكان لەم ناوچەیەدا شتێكی وا نەبوە كە كاربكاتە سەر قەومیەتەكەیان.

***<u>(گەزەنەفون)</u>*** شاگردی سوقراتی یۆنانی لە گەڕانەوەی دە هەزار كەسەكەیا لە(401)ی پێش میلاد ئەڵێت: بە وڵاتی(كردوك)ە كانا تێپەڕین گۆیا ئەم ناوەی لە ئەرمەنیەك بیستوە، وە(ك) لە ئەرمەنیدا بۆ(جمع)ە و لەوشێن(خ)دانیشتوە. كە(ك)كە لابەین(كردو)ئەمێنێتەوە.

مێژونوسەكانی عەرەب وشەی كورد لە(بقردی)یا(بقردا)وە ئەزانن. وەیا ئەڵێن: (كوردی كوڕی مردی كوڕی صعصعەی كوڕی هەوازن)و یا(كوردی كوڕی عمروی كوڕی مزیقیا) وەیا(كوردی كوڕی عامری كوڕی ماء السماء). طبری ویاقوتی و ابن اثیر وا ئەڵێن. مسعودییش هەندێ جار ئەڵێت: (كورد لە نەتەوەی كوردی كوڕی ئەسفەندیاری كوڕی مەنوچهری پێشدادییە).

هەندێكیش ئەڵێن: (كورد) لە (گورد)ە، گورد بەمانا پاڵەوانە.

ئیتر هەر كەسە بە جۆرێك قسەی لە وشەی (كورد)ەوە كردوە، ئاخر لێكۆڵینەوەیەك كە ئێمە لە بارەی وشەی (كورد)دا كردمان بیرو باوەڕمان هاتە سەر ئەمە:-

وشەی (كورد)هەر ئەو(كردوك) و(كردوئن) و (كردوخوی)یا(كاردخوی) یە یەكە گەزەنەفون و استرابون توشیان بوون، ئەمە ڕەوشتێكە لە كۆنەوە هاتوە هەر قەومێك ویستبێتی ناوی قەوم یا شوێنێكی تر بێنێت بەپێی زەوقی زمانەكەی خۆی ناوەكەی وتوە، واتە زمانەكەی ئەو وشەیە بە چە جۆرێك بەلاوە سوك بوبێت بەو جۆرە وتویەتی:یونانیەكان بەوە كە لە ئەمەرنیان بیستوە(كردوخوی)-جا ئایا ڕاست بو بێت یا درۆ-هەر بەو جۆرە لەسەری ڕویشتون، دیسان گەزەنەفون كە گوێی لە(كردوئن) ڕۆیشتوە. تاریخ ساغی كردۆتەوەو ئەیشی كاتەوە كە مەبەست بەم هەمو وشانە قەومی(كورد)بوە بەڵام لەوتنەكەیدا بەهەڵەدا چوون.




وشەی (کورد) لە بناغەدا لە(گوت)ەوە هاتوە، گوتەکان ئەوەبو یەکێ بون لە قەومەکانی زاگرۆس و پێش (ماد)ەکان کەوتبون. کە کەوتە دەوری پادشایەتی(توکولتی– نیراری)– پادشای ئاشور– ناوی (گوت–گوتی) بو بە(کوت– کوتی)و (کورت–کورتی)، ئەم تێکدانەش هەمو دور کەوتنەوەی زەمان وای لێ کرد. دیسان لە پێش ئیسلامدا بە (کورد) ئەوترا(کورت) بەتایبەتی لە(کارنامەی ئەردەشێری بابەتەکان)دا کە باسی جەنگی ئەردەشێرو کورد ئەکات لە مەعبەینی سەدەی شەشەم و حەوتەمی پێش میلاد دا وشەی (کورد)ی بە زمان و بەخەتی پەهلەوی بە(کورت) نوسیوە، و ئەم (کورد)بە(کورت) کردنەش لەبەر نزیکی شوێنی دەنگی(ت) و(د)ە وەکو ئەو نزیکیە ئێستەش لە کوردیدا هەرماوەتە بە جۆرێکی وا کە گەلێك جار(ت) ئەکرێت بە(د) و (د)یش ئەکرێت بە(ت)وەکو ئەڵێت: (تێم، دێم) و یا ئەڵێت(گرتی، گردی) تەنانەت ئێستە مەسەلێك لە کوردیدا هەیە کە کوردەکان دائەنیشن لە بەینی یەکداو باسی کورد دێتە پێشەوە بە توڕە یێکەوە ئەڵێن: ((کورد کورتە))هەرچەندە ئەوان لەو کاتەدا مەبەستیان ئەوەیە کە کورد لەبەرئەوە زۆر فیکر لەشت ناکاتەوە تیایا سەر ناکەوێت و کوڕتی ئەهێنێ، بەڵام ئەهلی عیلم و فیکر مەعنای والێئەدەنەوە ئەڵێن:(کورد) کە لە(کورت) وەرگیرا بێت وە(کورت)یش بە زمانی کوردی یانێ درێژنیەو بێ پشوە ئیشەکەی لە مەچاتر نابێت). ئەمەش بەڵگەیەك بو بۆئەوە کە وشەی(کورد) لە(کورت)ەوە وەرگیراوە، و(کورت)یش لە(گوت)وە گوت ناوی ئەو قەومەی زاگرۆس بووە. ئەمەش پێچەوانەی ئەوە نیە کە وترا(کورد)لە(ماد)ە، چونکە مادەکان کە سەرکەون ئەچنەوە سەر (گوت– گوتی).

ئەمێنێتەوە سەر(کردوخوی) کە وشەی(خوی) نیشانەی(جمع) بو، ئەم نیشانەیە کە، لابرا(کردو)ی ئەمێنێتەوە لەگەڵ(کردوك)ە کەی گەزەنەفوندا یەك ئەگرێتەوە ئەمیش (ك)کە بۆ(جمعە). (کاردخوی)ش هەر(کردو خوی)و(بۆر)ی کافەکەیان بەسەر خوێندۆتەوە . وردە وردە ئەم(سەر)ە بوە بە(أ)و ئیتر بەو جۆرە هاتۆتە خوارەوە تاوای لێهات(أ)و کە بوە ناواخنی و شەکە لەگەڵ ئەوەش وانیە.

کەوابو ئەو(و) و کە لە ئاخری (کردو) دا هەیە ئەسڵیەو لە نوسیندا کە خرایە پاڵ وشەی(ستان)واتە (جێ) ئەبێت بنوسرێ، یانێ بنوسرێ(کوردوستان).

سەرچاوە:

مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلادین سەجادی، بەغداد چاپخانەی مەعاریف چاپی دووەم، 1970.

# ئەدەب چی‌یە و رەوانبێژی چییە؟

## چ ئاشنایەتییەکیان پێکەوە هەیە؟

ئـەدەب بـە چـەمکی گشـتیی گوزارەیـەکی زۆری هەیـە، بـەلاّم بـە جۆرێکی تایبەتی و بۆ قسە لێوە کردن لەم شوێنەدا بریتیە لەو:

شتە نایابانە کە پێشینان هێشتویانەتەوە و بەجێیان هێشتوە بۆ دوای خۆیان، ئەوانەش وەکو هۆنراو و پەخشان، پیشەی قەشەنگ، موزیقاو ساز و ئاواز و وێنەی بە پەرداخ، ئەمانە بە قسەی جوانی مرواری ئامێز– نوسراوە بوو بن یا نەنوسراوە– بەڵگەی کۆنی سەر بەردەکان کە داستانی ئادەمیزاد ئەگێڕنەوە، ئەو نەوا کاریگەرانە کە لـە تـەلی موزیقاکانـەوە دەر ئەچـن و مێشـك و دڵ و دەروون گـولاّو پاشی ئەکەن.

جا ئەم ئەدەبە بەم جۆرە وەنەبێت تایبەتی بێت بە نەتەوەیەك و نەتەوەیەکی تری لێی بێ بەش کرا بێت، چونکە ئەمانە لە کرد و کۆشـی زانکـۆ–ی ئـادەمی–ن ، بـەڵکو وەکو تیشـکی خەتـەکانی رۆژ چۆن هـەموو لایـەك ئەگرنـەوە ئـەویش وایـە، ئەگـەر نەتەوەیـەك بـۆی نـەلوا بێت بەشـەکەی خـۆی شـارۆ بکـا ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە نەیبووە، بەڵکو ئەوە ئەگەیـەنێت کە بەرهەڵستێك لە ئارادا بووە بۆ ئـەو شـارۆ نەکردنـە، کـە بەرهەڵسـتەکە نـەما مەیـدان فراوانـە بـۆ کۆکردنەوەی، وەکو روناکی رۆژە کە لە ناو ژورێکی بە چوار دیوار گـیراوا دەر ناکـەوێت، هۆیەکـە دیوارەکـانن– کـە بەرهەڵسـتەکەیە– کاتێك ئەو بەرهەڵستە لاچوو روناکیەکە جێگای خۆی ئەگرێتەوە.

ئەمە ئەدەب، ئەمجا ((رەوانبێژی))(تان)ی ئەو ئەدەبەیە.

لـە زمـانی عەرەبیـدا بـەو قسـەو باسـەی رەوان و گـەوارا بێـت ئەڵێن(بلیغ)و (پاشان (بلاغە)ی لێی وەرگیراوە بۆ هەمووی و بووە بە ناو بۆ زانیارییەکە.

لە زمانی کوردیدا ئەو چەمکە کە(بلاغە)ی لـە زمانی عەرەبیدا بۆ دانـراوە وشـەی (ڕەوانبێـژی) بـە تـەواوی پـڕی ئەکاتـەوە بـەڵکوو زیاتریش. و بۆ(بلیغ)ە کەش من بەلامەوە(پاراو)جێگای خۆیەتی.

جـا لەبـەر ئـەوە وشـەی (ڕەوانبێـژی)بـۆ ئـەو زانیایـە دانـراوە، و تەنانـەت ئـەتوانرێت بوترێـت وشـەی(خۆشـخوانی)ش هـەر چەشـنی مەبەست ئەدات بە دەستەوە.

ڕەوانبێـژی، و یـا خۆشـخوانی روو لـە سوچـێك لـە سوچـەکانی ئـەدەب ئەکاتـەوە، واتـە روو لـە قسـە بـە هـەر دوو چەشـنەکەیەوە هـۆنراو و پەخشـان– ئەکاتـەوە، ئـەو هـۆنراو و پەخشـانە ئـەبێت بـە پێـی پلـە تێگەیشـتنیان تێـدا هـەبێت، تێگەیشـتنەکەش بـە هـۆی هونـەرە قسـەییە ئاشـکراکانەوە ئـەبێت، ئەمانـەش لـە نـاوی چوارچـێوەی رەوانبێـژی دان کـەوا بـوو ئاشـنایەتی ئـەدەب و رەوانبێـژی وەکـوو ئاشـنایەتی مـرۆڤ و گیانلەبـەرە، مەرجـە هـەموو مرۆڤێك بەر گیانلەبەر بکەوێت، بەلاّم مەرج نییـە هـەموو گیانلەبـەرێك مرۆڤ بێت.

وتـرا کـورد ئـەدەبی هەیـە، کـە هـەیبوو ئـەبێت رەوانبێژی هـەبێت، ئەمیش هەر وەکوو ئەدەبەکـە و نـەبێت تایبـەتی بێت بـە زمانێکـەوە، بـەڵکو هـەموو زمانێـك بـۆی هەیـە لەسـەر رێچـکەی زمانەکـەی خـۆی بەشـی خـۆی لێـی وەربگرێـت. لەبـەر ئـەو ئێمـەش ئـەتوانین بڵـێن: رەوانبێژی لە زمانی ئێمەش دا هەیە. جا بەو بۆنەوە ئەڵێن:

رەوانبێژی لەسـەر ئـەو چـەمکە کـە زمـانی کـوردی وەری ئـەگرێت لەگـەڵ باسـی زانیـاریی زمانـەکانی تـردا– کـە هـەر یەکـە بـۆ خۆیـان کردووە– بریتیە لە دەربڕینـی کۆمەڵـە گوزارەیـەکی فـراوان لـە قاڵبی چەند وشەیەکی کەم دا.

راسـتە وشـە لـە دایـەخی ئـەوە دەرنایـە کـە بـەر فراوانـی باوەشـی خۆی بۆ گوزارە والاّ بکاتەوە، بەلاّم ئەو جارانە کە تا ئەندازەیـەك لـە دایەخی دەردێت ئەتوانرێت بە رەوانبێژی ناو ببرێت.

ئەم لە دایەخ دەر نەهاتنە هەندێك جار روو لە تام و چێژی خاوەن قسەو گوێگر ئەکاتەوە، کە ئەو خاوەن قسە، و یا بڵێن قەسەکەرە بـە جـۆرێکی تایبـەتی گـوزارە پـەنگ خواردووەکـانی دەروونـی ئەڕژێنێتەوە ناو قاڵبی وشەوە، گوێگریش بە سۆزێکەوە وەکو هەنگ



چۆن شیرەی گوڵ ئەمژێ، ئەویش پەردەی دڵ و دەروونی هەڵئەداتەوە بۆ وەرگرتنی ئەو وشە گوزارانە وەریانئەگرێت و هەڵیانئەمژێت.

هەندێك جاریش یا روو ئەكاتەوە ناوەڕۆكی شتەكەو بە تەواوی ئاراستەی ئەو ناوەرۆكە ئەبێت بۆ هەڵسەنگاندنی، یا راستە و راست روو ئەكاتەوە وشەو گوزارە بۆ رازاندنەوەیان.

یەكەمیان لە زانیاری رەوانبێژیدا من بەناوی(گوزارەكاری– مەعانی)). دووەمیان ((رەوانكاری– بەیان). سێیەمیان( جوانكاری بەدیع)ەوە ناویان ئەبەم.

دیارە ئەم سێ لقەش خۆیان لە ناو وشەكانی خۆیانا ئەتوێنەوە، واتە هەر یەكەیان ئەبن بە چەند هونەر بەشەوە.

### ئاشنایەتی رەوانبێژی و لێكۆڵینەوە

مەبەست بە لێكۆڵینەوە لەم شوێنەدا ئەوەیە كە لە پارچەیەكی ئەدەبی ورد بینەوە بۆ ئەوە بزانین دروست و تەواوە، یا خەوشێكی تێدا هەیە و راستیەكەی ون بووە. بۆیەش مەبەست ئەمەیە چونكە لێكۆڵینەوە بۆ شتی تری غەیری ئەدەبی–ش بەكارهاتووە، واتە بۆ شتی كردەوەیی، و یا بێژراوی. لێرەدا مەبەست بێژراوەیەو مەبەست ئەوەیە لەو جەوهەرە مەعنەوییەوە قسە بكرێت بۆ ئەوە پەردەی تاریك لە ڕوویا هەڵبدرێتەوە.

ئەدەب خۆی لە مەعنەویاتە، كە ئەڵێن لە مەعنەویاتە، واتە ئەو چەمكانەی كە لەودا هەن وەنەبێت شتێك بن كە بەچاو ببینرێن، و یا بە دەست بگیررێن، لێكۆڵینەوەكە ئەو جەوهەرە حەقیقیە دەر ئەخات.

***<u>بەلاغە بۆ چییە؟</u>***. دیارە بۆ ئەوەیە كە ئەدەبەكەی روون بكاتەوە، واتە زانیارییەكە جەوهەری ئەدەبەكە پیشان ئەدات. دوور نییە بوترێت هەر شتێك لە زانیاری بەلاغەدا باسبكرێت لە زانیاری(نەحۆ)یشدا هەیە. بەڵێ ئەمە راستە بەڵام زانیاری نەحۆ شتێكی ترەو زانیاری بەلاغە شتێكی تر. شتی وا ئەبێت بەلای بە لاغەوە راستە، كەچی زانیاری نەحۆ دانی پیا نا نێت، هەروەها پێچەوانەكەشی.

جا ئەم بەلاغەیە ئەدەبەكە بەش بەش ئەكاتەوە، هەندێكی بە جوانكاری، هەندێكی بە رەوانكاری، هەندێكی بە گوزارەكاری. چۆن دەغڵێك سەرەتا(كەو)پاشان(سەرەن)پاشان(بێژنگ)ئەكرێت تا پوختەكەی بە تەواوی دێتە دەست، بەلاغەو ئەدەبیش وایە، ئەدەبە كە هەیە، بەلاغەكە ئەو ئەدەبە پوختە ئەكات و دیمەنێكی جوانتر لە قسەكانا پەیدا ئەبێت.

لێرەدا مەرج نییە هەر شتێك– بە تایبەتی قسەو نوسین– ناوبرا بە ئەدەب (بلیغ و پاراو)بێت، بەڵام مەرجە لەم روەوە هەر شتێك بەلیغ بوو ئەبێت بە ئەدەب و ئەدەبە. زانیاری بەلاغەكە(تان)و (پۆ)یەكی ئاوریشمە بۆ پارچەی خۆماڵی ئەدەبەكە.

ئەمجا بەلاغە و لێكۆڵینەوە.

ئەبێت ئاشنایەتیەكی تەواو هەبێت لە نێوانی ئەم بەلاغە و لێكۆڵینەوەدا، چونكە بەلاغەكە بۆ ئەدەبەكەیە، لێكۆڵینەوەش هەر بۆ ئەدەبەكەیە.

ئەتوانین بڵێن كە لێكۆڵینەوەكە بە دوو چاو سەیری ئەدەبەكە و سەیری بەلاغەكە ئەكات. لێكۆڵینەوە كە لە سەر بناغەی ئەو زانیاریە كە هەیەتی وەكو چۆن سەیری گرانی و سوكی، بەرزی و نزمی ئەدەبەكە ئەكات، بەو جۆرەش ئەچێتە پارێزەوە بۆ سەیر كردنی بەلاغەكە. بەڵكو بەلاغە، كە بریتی بوو لەو سێ بابەتەی پێشوو، و هاتە سەر ئەوە كە ئەدەبەكە لەناو ئەوانەدایە، بوو بە وەكو هەڵم لە ناو ئاودا بوو بەوان. لێكۆڵینەوە كە ئیتر لەوانەیە بە تەواوی گۆری خۆی ببەستێتەوە بۆ پەلاماردان لەو بابەتانە.

ورد ورد تەماشای ئەوە ئەكات كە ئایا ئەو ئەدەبەی كە بەلاغە بە جوانكاری، و یا ڕەوانكاری، و یا گوزارەكاری داناوە ڕاستە وان یان نەء؟ ڕاستە هونەرە قسەییە ئاشكراكان لەو بەشەدا هەن؟ ڕاستە ئەو زانیارییە كە چۆنیەتی وشەی پیێ ئەزانرێت، ئەو زانیارییەی تێدا هەیە؟ ڕاستە گوزارەی بەرزو ناسك لەو ڕستەیەدا هەیە؟ ڕاستە جوانیی وشە لەو شوێنەدا هەیە؟ ڕاستە كە یەك گوزارە بە هۆی وشەی جۆراو جۆرەوە باسبكرێت؟ و یا یەك وشە چەند گوزارەی لێی وەر بگیرێت؟. ڕاستە لە باری گوزارەكارییەوە ئەزانرێت كام وشە و یا جوان و دڵگیرە و یا جوان نییە؟

لێكۆڵینەوە سەیری ئەوە ئەكات كە هەر یەك لەمانە شوێنی خۆیانیان گرتوە؟ یان نەء؟ بە دوو چاوی تیژو ورد بین تەماشا ئەكات. ئەوەی كە قوتابخانەی بەلاغە بەخوازە، یا خواستن، یا دركە، یا وەك یەك، و یا كورتبڕی، یالێكدان، و یا هونەرەكانی تری داناوە ئایا وانە یان نەء؟. وەكو وەستایەكی گڵكاری لێدێ كە واخشت و نەخشی زێڕرین لە خەلفەكە وەربگرێت و دایبرڕێژێت، چونكە لێكۆڵینەوە سەیری دەق ئەكات، سەیری چەشنی نووسینی ئەو دەقە ئەكات.

سەیری ئەوە ئەكات كە ئەم دەقە هی كێیە، و هی چ سەردەمێكە. سەیری ئەوە ئەكات كە دەقی ڕەسەن لە هی لاوەكی جیا ئەكاتەوە، وشەی زبرو نەرم لە یەك ئەكاتەوە، ئەزانێت چ وشەیەك بۆ چ شوێنێك دەست ئەدات، چ ڕستەیەك بۆ چ جێگایەك بە كەڵكە، كام وشە و ڕستە كاریگەریەكەیان زیاترە بۆ جێگای خۆیان، ئەم لێكۆڵینەوەیە بۆمان ڕوون ئەكاتەوە كە خاوەنی دەق توانیویە سەركەوێت لە بەرهەمەكەیا، یان نەء؟

گومانی تێدا نیە ئەو دەقە كە لێكۆڵینەوە ئەم بژارەی تێدا ئەكات ڕستەو هۆنراو وشەیە، خاوەنی بەلاغە ئەو ڕستە هۆنراو وشەیە كە هێناویە و ناوی گوزاركاری و ڕەوانكاری و جوانكاری بۆ داناوە، ئەم ئەتوانێت– واتە لێكۆڵینەوە– لە پاش وردبونەوە ڕەخنە لە خاوەن بەلاغە بگرێت بڵێت: ئەوەی كە تۆ لە زانیارییەكەی خۆتا بەكارت هێناوە، لەبەر ئەم هۆیەو ئەو هۆیە ئەو وشەیە، و یای ئەو ڕستەیە بە كەڵكی ئەو شوێنە نایە.

كەوا بوو ئاشنایەتی لێكۆڵینەوە لەگەڵ بەلاغە دا وەكوو ئاشنایەتی بەردی مەحەكە لەگەڵ زێڕدا، چۆن ئەو بەردە زێڕێكی پوختەت بۆ ئەدۆزێتەوە وئەیدا بە دەستەوە، ئەمیش كرۆكێكی پوختەی ئەدەبی ئەدۆزێتەوە وئەیخاتە بەر چاوی ئەهلی بەلاغە.

لەمەوە ئەوە دەرئەكەوت كە چەندە ئاشنایەتی ئەدەب و ڕەوانبێژی پێكەوە هەیە، ئاشنایەتی لێكۆڵینەوە و ڕەوانبێژی گەلێك بە تینترو بەهێزترە لەو، چونكە بەلاغەكە هەر ڕوو لە ئەدەبەكە ئەكاتەوە، بەڵام لێكۆڵینەوە كە ڕوو لە بەلاغەكە و لە ئەدەبەكەش ئەكاتەوە و لە پارێزایە بۆ هەر دوو لایان.

## گرێلێدان

لە زمانی كوردی دا ڕستە، و یا(واژە)ی (زمان پاراو) هەیە، ئەمە بەلای منەوە ئەو چەمكەیە كە لە زمانی عەرەبیدا بە وشەی(فصیح)و(فصاحە) گوزارشتی لێی دراوەتەوە. ئەڵێت: (زمانێكی پاراوی هەیە)، واتە فەسیحە و هیچ گرێ و گۆڵی نایەتە بەر زمان. دیارە یەكێك كە زمانی پاراو بوو بە ڕەوانی قسەكانی لە دەم دێتە دەرەوە و هەڵەی تێدا نابێت، و یا كەم ئەبێت. ئەوەی كە هەڵەی تێدا نابێت ڕەوانبێژی و بەلاغەكە ئەگرێتەوە. ئەم ڕەوانبێژیەش لە هەموو سەردەمێكا ئەوەیە كە ئەو قسانە شان بە شانی چۆنیەتی بابەتە كە بڕوا بەڕێوە، واتە لەگەڵ(مقتضـی حال)دا بەرانبەری بكات، لەم بەرانبەری كردنەكەدا بابەتەكە بڕوات بەڕێوە، واتە لەگەڵ (مقتضـی حال) دا بەرانبەری بكات، لەم بەرانبەری كردنە بەشەكانی ڕەوانبێژی دروست بوون.

باسی ((گرێ لێدان))كە دێتە پێشەوە ئەوەیە كە ڕەوانبێژییە كە ئەو گرێ و گۆڵیەی كە بە(گرێلێدان) گوزارشتی لێدراوەتەوە تێدا نەبێت، بەڵام ئەبێت بزانرێت كە ئەم گرێ و گۆڵیانە چین؟ بۆ ئەوە تۆ كاكڵەكەت بۆ دەركەوێت؟

ئەگەر هەموو شت چاك بوو خراپت بۆ دەرناكەوێت، پێچەوانەكەشی: ئەگەر هەموو شت خراپ بێت، چاكت بۆ دەرناكەوێت. كەوا بو ئەبێت ئەوە بڵێین ئەو شتە خراپە بۆ ئەوە چاكەكەت بۆ ڕوون ببێتەوە، و یا ئەو شتە و ئەو شتە چاكە بۆ ئەوە خراپەكەت بۆ دەركەوێت.

ڕاستە گرێ لێدان بەلای زانایانی ڕەوانبێژییەوە لە هونەرەكانی ڕەوانبێژ نییە، بەڵام ئەبێت ئەوە بزانین كە ئەم گرێ لێدانە كامەیەو چییە؟ هەتا تۆ بتوانی ڕاستیەك بخەیتە ڕوو. جا لەبەرئەوە بەلای منەوە باسكردنی گرێ لێ دان لە باسی بابەتەكانی ڕەوانبێژیدا باسبكرێت. كە ئەڵێن باسبكرێت مەبەست ئەوە نییە كە خودی گرێ لێدان لە كرۆكی ڕەوانبێژو زمانپاراوییە، بەڵكوو مەبەست بابەتەكەیە. پێچەوانەی ئەم گرێ لێدانە– كە گرێ كوێرەی تێ ئەكەوێت– (ئاشكرا– وضوح)ە وضوح خۆی بە هۆی(تەغلیب)ەوە



بوو بە یەکێك لە بابەتەکانی رەوانبێژی، ئەو بابەتانە کە ئەبێت رەوانبێژی لە مانەی تێدا نەبێت.

ئەمە و دیسان ئەگەر راستت ئەوێت، ئەوی ئەم خێوەتی رەوانبێژ و بەلاغەیە دایگرتۆتەوە هەمووی لە(نحو)و(منطق)دا هەیە، هەر ئەو قسانەی نەحۆ و مەنتقە ئەم ئەیانکات بە رەوانبێژی. ئایا ئەمە ئەشێت کە بوترێت: قسەکانی رەوانبێژی هەموو لە زانیارییەکانی نەحۆ و مەنتق دا هەن، کە وا بوو ئیتر پێویست بەوە ناکات زانیارییەکە سەربەخۆی بۆ دابنرێت و بە رەوانبێژی ناو ببرێت؟!. دیارە ئەمە ناشێت، چونکە هەر زانیارییەك کەسیەتی خۆی هەیە و ئەبێت لە ناو چوارچێوەی ئەو کەسیەتەدا باسی وردو درشتی بکرێت.

بابەتێکی وەکو گریٚ لێدان ئەگەر لە ناو چەنبەری ڕەوانبێژیدا باس نەکرێت، ئەی لە کوێدا باسبکرێت؟!. کە ئەمە هەبوو ئەویش خۆی بوو بە بابەتێك لە بابەتەکانی رەوانبێژی، بەڵام بۆ دورکەوتنەوە لێی، نەوەك بۆ نزیك بوونەوە.

ئیتر لەبەر ئەمە من هاتم لە پێش هەموو بابەتە سەرەکیەکانا(گریٚ لێدان)م دانا، بۆ ئەوە ئەمە ببیٚ بە دەروازیەك بۆ چوونە ناو هەموو بابەتەکانی رەوانبێژییەوە. و لە باوەڕی من ئەبێت بایەخ بدرێت بە گریٚ لێدان. جا زانایانی بەلاغەی عەرەبی گویٚ ئەدەنیٚ، یا نایدەنیٚ من گویٚ بەو گویٚ دان و نەدانە نادەم!.

دیسان دوور نیە بوترێت شتێك کە بەکێشە بوو بۆ تێگەیشتنەکەی بۆ چ ئەبێت ئەمە بەر هونەر بکەوێت؟.

لە وەڵام دا ئەوترێت بە جۆرێکی تێکڕایی کەڵك لە هونەری بە تایبەتی گوزارەکاری‌دا – ئەوەیە کە نەوس لە باری وشەو گوزارەوە لەزەت و خۆشیەك وەربگرێت، وەرگرتنەکەش ئەوەیە کە گەلێك شت لەدڵی خاوەن(دەق) دا پەنگ ئەخواتەوە، دێنێت بە جۆرە وشەیەك دەریان ئەبڕێت کە خوێنەر، و یا گوێگر لە پاش خەریك بونێك لە گەڵیا و لەپاش زانینی پشویەکی خۆشی پیا دێتەوە. دیارە ئەمە بێگومان بۆ نەوسی ئادەمیزاد بەهرەیە کە، کە بە هۆی ئەو وشانەوە وەری ئەگرێت و حەسانەوەیە کە بۆی.

کەوا بوو دەتوانرێت بوترێت(گریٚ لێدان) هەر چەندە لە رواڵەتا گریٚ کوێرەیە بەڵام لە ناوەڕۆکا حەسانەوەی نەفسە و نەفس پێی گەشەدار ئەبێت.

***

جا ئەم گریٚ لێدانە وا ئەبێت لە وشەدا ئەبێت، و واش ئەبێت لە گوزارەدا ئەبێت. کە وا بوو بوو بە دوو بەشەوە.

وشەییکەش ئەگونجیٚ بەهۆی پێچ و پەنایەك بێت کە لەوشەکانا هەیە. واتە لە ریز کردنی ئەو وشانە کە لە رستەکەدا هەن پێچ و پەنایەك هەیە بۆ وەرگرتنی گوزارەکە، و یا راناو وهێمایەکی زۆریان تێی ئەکەوێت، و یا دانانی جۆرە وشەی وا لە چەشنە رستەیەکی وا دا ئەبێت کە سڵەماندنەوەیەك ئەدا بە گویٚ و تەزوێك بە نەفسەکەدا دێت.

کەوا بوو وشەییەکەش بوو بە چوار بەشەوە.

بەشی دووەم لەو گرێ لێدراوە ئەوە بوو وترا گوزارەییە.

لـەم گوزارەییـەدا وا دیـارە خـوازە و درکەخواسـتن بـە تـەواوی دەستیان تێدا هەیە، با رستەش پەخشان بێت، چونکە خاوەن رستە بە بەکارهێنانی هەندێك وشە کە رستەکە یا ئیشێکی وا ئەکات کە بە تەواوی خۆی لە گوزارە راستەقینەکە دوور ئەخاتەوە.

لـەم بەشـەیانا دوور نیـە نیازەکـە لـەدڵی خـاوەن دەقا بـە تـەواوی چەسپ نەبوو بێت بۆیە ئەم گرێ لێدراویە پەیدا ئەبێت.

جا ئێمە لێرەدا بۆ بەشەکانی گرێ لێدراوی وشـەیی هەریـەك وێنـە دێنینەوە، ئەوەش بەر ئەوەیان ئەکەوێت کە راناو هێمایـەکی زۆر لـە رستەکەدا بەکارهێنرابێت و گرێ لێدراویەکەی دروست کردبێت، بۆ سێ بەشەکەی تر خوێنەر ئەتوانێت خۆی لێی بداتەوە.

هۆنەر ئەڵێت:-

***عەتارد،موشتەری، مەرریخی دەورانە***
***نیگاری من لە ناویانا نیشانە سونعی سوبحانە***
***ئەگەر ئەم بێ، وە یا ئەو بێ، وە یا جوزئێکی ئەم ئەو بێ***
***وە یا هیچ یەك نەبێ هەر خارجێ ئەوسافی ئینسانە!***

تەماشـــا ئەکـــەین یەکـــەم نیـــوە هـــۆنراوی دووم ئەوەنـدە(ئـەم)و(ئـەو)تێـی کـەوتووە- کـە ئەمانـە راناوو هێمـان- بـە تەواوی.

لەوانەیـە سـەریان لـە خوێنـەر تێکـدابێت و گـرێ لێـدراویان لـە هۆنراوەکانا دروستکردووە.

و بۆ گوزارەییەکەش (بیخود)ئەڵێت:

***غەزالی ئاگرین وەختێ کە بورجی ئاسمانی گرت***
***نیهالی قامەتی رۆمی لەگەڵ زەنگی بەرابەر کرد***

مەبەسـتی هونـەر بـە غـەزالی ئـاگرین کـوورەی (رۆژ- خـور)ە، یـە بورجی ئاسمان بورجی(حەمەل)ە، بە رۆمی(رۆژ)و زەبەنگی (شەو)ە.

مانای تێکڕای ئەوەیە ئەڵێت:

کاتێك رۆژ گەیشتە بورجی حەمەل، شەو و رۆژ بەرانبەر وەستان و بـــوون بـــە ئەنـــدازەی یـــەك. دیـــارە ئەمـــەش رێ کـــەوتی شەوی(21)مارت کە شەوی نەورۆزە.

بەرانبـەری بـە گـرێ لێـدراو(ئاشـکرا)هەیـە، ئاشـکراش ئەوەیـە کـە هیـچ یـەك لـە بەشـکانی گـرێ لێـدراوی تێـدا نـەبێت، نـە وشـەیی، نـە، گـوزارەیی. وێنـەش بـۆ ئەمـەیان وەکـوو((پیرەمێـرد) لـە باسـی سەرچاوەی (زەڵم) هۆنراو ئەڵێت:

***ئاوە جوانەکی سەرچاوەی زەڵم***
***بۆ گەڵا رێزان سەر بە تەم و هەڵم***
***ئەڵێ سەرچاوەی بەختی کوردانی***
***سرەوتت نی‌یە، وێڵی هەردانی***
***تاڤگەکەت سەر بەرز ساردە وەك تەرزە***
***دانەی مرواری لەنجەی سەد تەرزە***
***لەو ئاسمانەوە ئەڕژێتە خوارێ***
***لە چاوی گەردوون فرمێسك ئەبارێ***
***وێنەی عاشقێ کە ناڵەکار بێ***
***سەحرانەوەرد بێ، پەیجۆری یار بێ***
***وێڵ و سەرە رۆ، بە ڕۆ ڕۆی پر دەرد***
***لە قەڵبەزەوە سەر ئەدەی لە بەرد***
***دەست لە ملانێ لەگەڵ تانجەڕۆ***
***بەسەودای سیروان شەیداو ڕەنجەڕۆ***
***لە((دواوان)دا کە یەك ئەکەوێ***
***دوو(مصرعی)) بۆ بەیتی مەولەوی:***
***(سیروان)ی ئەم چەم(تانجەرۆ)ی ئەو چەم***
***بدەن بە یەك دا ئەم چەم تا ئەو چەم***
***مەوەستە برۆ بە لم و خاکا***
***بگری لە بارگەی سەلمانی پاکا***
***پێی بڵێ قوربان تۆ ناوت پاکە***
***بمانخەرە ڕێی یەکیەتی و چاکە***
***لەبەر ئاودێری ئەو خاکە دێمە***
***کە پاراو ئەبێ بەی ئاوی ئێمە***
***با گوڵ و نێرگس هەر دوو پێکەوە***
***شادبن بە دڵی ڕێك و پێکەوە***

وەکـوو سـەیر ئەکـەین هۆنـەر باسـێکی گرتـووە بـە دەسـتەوە کـە باسـی دیمـەنی(زەڵـم)و (تانجـەرۆ)و(دواوان)ە، بـە رەوانـی هێناویەتـە خوارەوە، بە بێ ئەوە هیچ گرێ و گۆڵێکی تێدا هەبێت.

دیـارە ئەمـە ئـەو(ئاشـکرایەیە—وضـوح)ە یـە کـە قوتابخانـەی ڕەوانبێـژی لێـی دواوە و هـەموو مـەرجێکی ئـەو رەوانبێژیـەی تێـدا هاتۆتە دی.

سەرچاوە:
خۆشخوانی، علاالدین سجادی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا 1978.

# پەخشانی هونەری

***1-پەخشان:***

عەرەب و فارسەکان سەرەتا تەعریفی پەخشانیان وا بەم جۆرە بە سادەیی کردوە. وتویانە:

((پەخشان قسەو رستەیەکە، کە نەبەسترا بێت بە کێش و سەرواوە)).

شارەزایانی ئەدەبی کوردی-ش بەپێی ئەو سەرنجەی کە داویانە لە پەخشانی کوردی بەم جۆرە ناساندویانە:

(پەخشان بەو قسە و ڕستەیە ئەوترێت کە هۆش و هەستی مرۆڤ پیشان بدا و بێ بەش بێت لەکێش و سەروا).

لەگەڵ ئەوەشا کە پەخشان و هۆنراو هەردوکیان ئەدەبن بەلأم لە یەکیش هەر جوێ دەبنەوە، چونکە هۆنراو جگە لەوە کە دروستبونەکەی بە رەگەزەکانیەوەیە، و ئەوانەش بریتی-ن لە ئەندێشە، بیر، سۆز و رستە، کێش و سەرواشی هەر تێدا هەیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە پەخشان بە تەواوی دورە لە مانە، بەڵکو پەخشانیش لەو گەوهەرانەی هەر تێدا هەیە، ئەوەندە هەیە وەکو وتران بێ بەشە لەکێش و سەروا. بۆ وێنە لەم رستانەی لای خوارەوە کە ئەڵێت:

((یار نوستبو، لە ژور سەریا هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا، بای هەناسەکەم زوڵفە رەشەکانی لەرومەتی روناکی لادا!. بەلأم داخەکەم چاوە مەستەکانی نەکردەوە. ئەوەندە بێ بەخت و چارە رەش بوم لەگەڵ ئەوەی کە کزەی نەسیمی هەڵیکرد و تاریکی شەوی تاران، دو نێرگسە جوانەکەی ئەو- کە چاوەکانیە- هەر لە خەودا بون).

خاوەنی بیرەکە، کە (نالی)یە ئەگەر هەر بەم جۆرە بیخستایەتە سەر کاغەز پێی ئەوترا بەرهەمی ئەدەبی پەخشان، و یا پارچەیەك لە پەخشانی جوان، چونکە لە هەموو جۆرەکانی هەوێنی هۆنراوی تێدا هەیە" بیری ورد، ئەندێشەی ناسك، وێنە و نیگاری رەنگین، سۆزی بە جۆش. بەلأم ئەمە بە هۆنراو ناو نەئەبرا تا بەم جۆرەی لای خوارەوە لە ناوکێش و سەروایەکی تایبەتیدا داینەڕشتایە. وەکو وتویە:



له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

دەقەکانی ئەدەبی کوردی

(هەناسەم زۆڵفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی)

(نەسیم ئەنگوت و شەو رابورد، دو نێرگس هەر لە خەودایە)

و یا ئەم دو هۆنراوەی(جگەرخوێن) کە دەڵێت:

(یاران کۆ دێم ژ سۆر گول)

(رەشمار چڤینە سەر مل)

(خەنجەر بدەستە تێ دل)

(چ بکەن گلی گازن!)

ئەگەر هونەر بەم جۆرەی خوارەوە بیخستایەتە سەر کاغەز پێی ئەوترا پەخشان:

(ئەو یارەی کە روی وەکو گوڵی سورە، وا پرچەکانی وەکو رەشمار لول بووە. لەسەر ملە سپیە جوانەکەی بە خنجەری جوا هێرش ئەباتە سەر دڵی بێ توانا و زەبون بەرانبەری، ئیتر هاوار وداد چ دادێك دەدات!).

***2-جیاوازی پەخشان و هۆنراو:***

لەگەڵ ئەوەشا کە هۆنراو پەخشان لە یەك نزیکن، چونکە هەردوکیان ئەدەبن و ئەدەب بەو دووە تەوا دەبێت. زۆر هونەری پەخشان هەیە وەکو چیرۆك، نامەی دەرونی- کە لە کاریگەریدا فرە لە گۆرانی نزیك دەبێتەوە- بەڵکو لە هەندێ روەوە لە یەك جیا دەبنەوە. ئێمەش لێرەدا بە کورتی هەندێك لەو هۆیانە دەخەینە بەرچاو:

***ا-هۆنراو و پەخشان:*** لە روی مێژویانەوە لە یەك جیا دەبنەوە. ئەویش ئەوەیە: لەبەرئەوەی کە هۆنراو زمانی سۆز و ئەو زمانەیە کە مرۆڤ لە سەرەتادا هەست و سۆزی خۆی پێ دەربڕیوە پێش ئەوەی کە بیرو هۆی وا فراوان ببێ و بیەوێت هۆشی بەکاربێنێت بۆ دەربڕینی

مەبەستەکانی. بەڵام کە مرۆڤایەتی پێش کەوت، تێگەیشتن زۆر بو، زانست و هونەر بە شێوەیەکی تەواو فراوان هاتە ناوەوە، مێشکی تێگەیشتن ناچاری پەخشان بو، بۆ ئەوە بتوانێت بە تەواوی جگە لە هۆنراو بە شێوەیەکی فراوانتر بیروباوەڕی خۆی دەربڕێ. لەبەر ئەمە دەستی کێشا بۆ پەخشان و ئیتر تا ئەندازەیەك شان بە شانی هۆنراو شوێنی خۆی گرت لە ئەدەب دا.

***ب- لەڕوی بابەتەوە- موضوع-:***

لەبەرئەوەی کە پەخشان بەرهەمی ژیرییە، زیاتر لائەکاتەوە بەلای درێژە پێدان و رونکردنەوە. ئەمە وەکو لە شتگێڕانەوە و کاروباری ئایینی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و شتی زانستی دا بەرچاومان دەکەوێت. بەڵام هۆنراو لەبەرئەوە کە زمانی سۆزە زیاتر لا دەکاتەوە بەلای جوڵاندنی هەست و کاریگەریەوە. دیسان لەبەرئەوە کە زۆرتر هونەر پیشان دەدات هەوڵی ئەوە دەدات کە بەکورتی و زو بە زو بیدا بە دەستەوە.

***ج- لە ڕووی گوزارەیەوە:***

ئەوە زانرا کە گەوهەر و ڕەگەزەکانی ئەدەب جگە لە داڕشتنەکەی سۆز و ئەندێشە و بیر بو. ئەمانە وەکو ڕەگەزی راستەقینەی هۆنراو بون، بو بە هەوێنی پەخشانیش، بەڵام ئەوەی کە هۆنراوەکە لە پەخشان جیا ئەکاتەوە لەم ڕووەوە ئەوەیە: کە سۆزەکە گەوهەری یەکەمی هۆنراوەکەیە بۆ ئەوە جوانی ژیان و جوانی گێتی لە دڵ و دەرونا ببوژێنێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوە کە پەخشان مەبەستی فێرکردن و رونکردنەوەی (راستی- حەقایقە) بیر زیاتر دەسەڵاتی تێدا هەیە تا ڕەگەزێکی تر.

***د-هەڵبژاردنی وشە:***

هەڵبژاردنی وشەی هەڵبژاردە و تایبەتی، بەکار هێنانی هەندێك لە هونەرە قسەییە ئاشکراکان، وەکو خواستن و خوازەو درکە زیاتر پێویستی هۆنراوە، بەڵام لە پەخشان دا ئەو زیادە پێویستییە بۆ بەکارهێنانی ئەمانە ئەوەندە نیە، جگە لەمەش بەکارهێنانی وشەی کورتکراوە لە هۆنراودا دروستە، بەڵام لە پەخشانا نابێت.

***هـ-لە هۆنراودا تایبەتی دەرونی هۆنەرەکە،*** وە یا بە واتەیەکی تر بلیمەتی و سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی زیاتر دەردەکەوێت، بەڵام لە پەخشانا وانییە.

***و-پەخشان نەبەستراوە بەکێش و سەرواوە،*** بەڵام هۆنراو پابەندی ئەم دوانەیە، لەوانەیە زۆرتر بێت ئەم دوانە هۆنراوی پێ نەوترێت.

***ز-هۆنراو ئەگەر داڕشتنەکەی*** خۆی نەما و خرایە سەر داڕشتنێکی تر دیمەنی هۆنراوەیی نامێنێ، بەڵام پەخشان ئەگەر وشەکانیشی بگۆڕێ گوزارەکەی هەر دەمێنێتەوە و دەتوانرێت بخرێتە ناو قاڵبێکی ترەوە و هەر پەخشانیشە.

***3- جۆرەکانی پەخشان بە گشتی:***

لە باسەکانی پێشودا ئاشنایەتی و جیاوازی میانی پەخشان و هۆنراومان بۆ دەرکەت، ئەوەمان بۆ رون بووەوە کە لە هەندێ روەوە لە یەك دەچن، و لە هەندێ روی ترەوە جیا دەبنەوە لەیەك. ئەوەندە هەیە لێرەدا ئەمانەوێ بزانین پەخشان بە جۆرێکی گشتی دەبێت بە چەند بەشەوە؟

دەبێت بە دو بەشەوە:

***أ-پەخشانی زانیاری، یا زانستی.***

***ب-پەخشانی ئەدەبی، یا هونەری.***

پەخشانی زانیاری ئەو پەخشانەیە کە مەبەستی دەربڕین و پیشاندانی ئەو راستییانەیە کە ژیری دەستی تیایانا هەیە، وەکو فەلسەفە، ژمارە، کیمیا... هتد. ئەگەر مەبەستی هەڵگیرساندنی سۆزو کارکردنی دەرونی بێ ئەوە پەخشانی ئەدەبی، و یا هونەری پێ ئەڵێن، وەکو نامەی دەرونی و یژدانی، دووان- خوتبە... هتد. خۆ ئەگەر ویستی حەقایقی پێ دەربڕێ بەڵام بە یارمەتی سۆزەوە بۆ ئەوەی کە زۆر بە تین و کاریگەر بێت، وەکو: مێژو، لێکۆڵینەوە و کاروباری رامیاری، ئەوە پێی ئەڵێن پەخشانی زانستی گشتی، یا هونەری گشتی.

هەروەها دەبێت ئەوەش بزانرێت کە پەخشانی هونەری هەموو گەوهەر و هەوێنەکانی ئەدەبی تێدا هەیە. وەك سۆز، ئەندێشە، بیرو واژەی بە ئاوازە. وە لێ پەخشانی زانستی، وە یا زانیاری تەنها بیرو واژەکەی تێدایە، ئەگەر لەوانە بو لێکچونی تێدا هەبو، ئەمە لەوانەیە هەر بۆ رونکردنەوە و تێگەیشتن بێت. لەراستیشدا لێکچون حەقی وایە هەر لە پەخشانا بێت زیاتر تا هۆنراو، چونکە سروشتی لێکچون بۆ (ایضاح)و ئاشکرا کردنە، ئەم ایضاح و ئاشکراکردنە بابەتی پەخشانە، نەوەك هۆنراو.

***4-بەشەکانی پەخشان:***

بە پێی باوەڕی ئەوروپییەکان.

ئەو بەشە بە ناوبانگانەی پەخشان لەسەر دانانی ئەوروپییەکان چوارن:

(مێژو، چیرۆك، زمانپاراوی- فصاحت- نامەکاری).

***1-مێژو:*** گێڕانەوەی روداوی جیهانی و ئەنجامیەتی بە جۆرێ کە بە باشی روداو و کارەساتەکە و چۆنیەتیەکەی بە چەشنێکی ئاشکرا لە مەردم بگەیەنرێت. وەکو مێژوی شۆڕشەکانی کورد لە کوردیدا.

***2-چیرۆك:*** نوسینی قسەی دروستکراو ورێکخراو، گێڕانەوەی ئەفسانە و داستانی دروستکراو کە بۆ فێرکردن و تێگەیاندنی مەبەستی خوورەوشت، یا مەبەستی تر ڕیز کرا بێت. وەکو چیرۆکی (کەرەلۆتی مەنوچەر)، و یا(رۆنە زەنگی حەمەسەن) لە کوردی دا. و یا (کلیلە و دمنە)لە ئەدەبی هیندی و ئێرانی دا.

***3-زمانپاراوی:*** رستەو قسەی کاریگەرە بۆ دەمکوت کردنی گوێگر و پڕکردنی دەرونی لە مەبەست و ئارەزوی قسەکە. وەکو مەبەستی رامیاری و ئایینی و داخوازی ماف. ئەم بەشی زمانپاراوییە کە چووە ناو کەمەی ئەو بەشانەوە بەم جۆرە ئەناسرێن و ئەزانرێن:

***1-زمانپاراوی رامیاری، یا پیلانی.*** ئەمە بۆ پیشاندان و رونکردنەوەی شتی رامیاری

وەکو ئەو قسانەی کە دووانەرەکان و قسەکەرانی بە دەم و پل لە کۆمەڵ و کۆبونەوەی گشتی دا دەیکەن، کە ئەم جۆرە قسانە دەبنە پێشەنگی گۆڕان و پێشخستنی باری رامیاری.

*ب-ئامۆژگاری ئایینی،* لە کاتی وەعز و فێرکردنی لێکدانەوەی یاساو کاروباری ئایینی کە واعز و قسەکەرانی بە توانا لەسەر دووانگە هەڵیئەڕێژن.

*ج-قسەرەوانی پارێزەری،* بۆ چەسپاندنی داوای ماف و سزادانی بەرانبەرە، کە پارێزەری قسەرەوان لە دادگا بە کاری ئەهێنێت.

جگە لەم سێیەش جۆرێکی تر هەیە کە مامۆستا لەکۆڕی دەرزا بە هۆی زمانپاراوییەوە لە کۆلیجەکانا، لە کاروباری زانیاری و ئەدەبییەوە ئەدوێ و جۆش و خرۆشێك ئەدا بە قوتابیەکان و ئارەزویان لە چەشەی دەرزو باسەکە تێر دەکات.

*4-نامەکاری:* ئەمەیان نوسینی قسەو باسێکە، کە لە نێوانی کۆمەڵانی مەردم دا باوە، هونەری نامەش ئەکرێت بە سێ بەشەوە:

*ا-نامەی ئارەزویی، یا خۆماڵی.*

ئەمە بریتییە لە نوسینی نامە بۆ خزم و کەس و کار هاوڕێ، کە ئارەزوی بینین، وە یا داد وفریاد لەدەست دوری لەیەك و خۆشەویستی و نادرنی دیاری و هەواڵپرسین و شتی تر لەم بابەتانە.

*ب-نامەی باو، کە بریتییە لە:*

نامە نوسینێکی بەکارهاتوی گشتی. وەکو: هی بەڕێوەبەرایەتی، بازرگانی، و یا کاروباری نێوان خەڵك. وەك کڕین و فرۆشتن، مارەکردن، ریێ کەوتن، کارتی پیرۆزبایی، پرسە، وەسیەت، پاڕانەوە، گلەیی و میوانداری. کە جۆری نوسین و وەڵام دانەوە و پایەی هەر کەس لەگەڵ ئەویترا دەستوری جیاوازی هەیە.

*ج-نامەی زانستی، بریتییە لەو:*

وتارانە کە لەباری شتی زاستی وکاروباری ئەدەبیەوە دەنوسرێن.

*5-دابەشکردنی پەخشان لای:*

*ا-عەرەبەکان:*

عەرەبەکان هەتا سەردەمی تازە بە تەواوی بەشەکانی پەخشانیان دیاری نەکردبو، بەڵکو هەر هۆنەر و هونەرمەندیێ لە سەردەمی عەبباسیەوە- کە ئەتوانین جگە لە(قران)بە یەکەم گێجی دابنێین بۆ پەیدا بون و پەرەسەندن وگەشەکردنی عەرەبی . بە پێی باوەڕی خۆی ناوێکی بۆ پەخشان داناوە (بەوێنە.قدامەی کوڕی جعفر )خاوەنی کتێبی (نقدالنثر ) ئەڵێت:

(پەخشان لەخوتبە . دووان، نامە، قسەو ناڕەزایی بەدەر نیە.) و یا بەجۆرێکی تر بەشیان کردوە،کە گوایە پەخشان

1-نوسینێکە پەرمۆنەوەی -اعتماد- بە قەڵەمە.

ب-دووان، دووان دانێکە پەرمۆنەوەی لەسەر زمانە. کە ئەمە هەمو هونەری پەخشان ئەگرێتەوە، ئەمەش بە پێی دابەشکردنی کۆن کە لە سەردەمی عەبباسی دا کردویانە. بەڵام لەم سەردەمەی تازەدا پەخشانی عەرەبی-ش شوێن و رێی پەخشانی ئەوروپی گرتۆتەوە و لاسایی ئەوی کردەوە. لەبەر ئەوە نوسین گەلێك هونەر و بابەتی لیێ جیابوەوە. هەروەها دوواندانیش گەلێك لکی لێی بوەوە. لەبەر ئەوە نوسەرە تازەکانی عەرەب پەخشانی عەرەبی وەکو هی ئەوروپیەکان بەش ئەکەن بە:

(دووان، نامە، قسە، نارەزایی. ئەمە ئەوەی قدامە).

(نوسین بە قەڵەم، دوان بە زمان. ئەم دووەش هی ئەوانیترن).

*2-لای فارسەکان:*

دابەشکردنی پەخشان لای فارسەکان بە پێی سەردەم و جۆری بابەتەکە و باوەڕی نوسەرەکانیان گۆڕاوە، هەرچەندە هەموی لەوە دەرناچێت کە سەراپا ئەکرێت بە سیێ بەشەوە:

1-گفت و گۆ، ب-دووان، ج- نوسین.

لەگەڵ ئەمەشا وەکو وترا ئەوانیش بەشەکانی پەخشان لەسەر دابەشکردنی ئەوروپیەکان، ئەیکەن بەم بەشانەی خوارەوە:

(مێژو، چیرۆك، زمانپاراوی- بە هەموو بەشەکانیەوە-، نامەکاری).

*3-لای کورد*

کوردیش هەروەکو نەتەوەکانی جیهان، وە یا هەر وەکو عەرەب و فارسەکانی دراوسیێ خاوەنی پەخشانە. پەخشان بەپێی ئەو جیاوازیەی لە ناو بەشەکانیا هەیەتی ئەکرێت بە چەند بەشێکەوە، و بەپێی ئەو بەشانە ئەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی سروشتی لە کۆنەوە هاتونەتە سەر ئەم بەشانە:

**(پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، چیرۆك، مەتەڵ)**

بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم دا، دوای ئەو جوڵانەوە ئەدەبیە کە هەموو نەتەوەکانی جیهانی گرتەوە و کوردیش یەکێك بو لەوانە، و دوای ئەوەی هەندێك لە بەرهەمی ئەدەبی-مان کۆکرایەوە ولێی چاپکرا، دەستکرا بە بوژاندنەوەی کەلەپوری نەتەوایەتی-مان، گەلێك بەرهەمی تازەو لە ژێر ناوی تازەدا هاتە مەیدانەو. وەکو: وتار، نامە، دوان، جۆرە چیرۆکی تر، شانۆگەری، گفتوگۆ، وتوویرەو گەشت نامە.

لەبەر ئەمە بەشەکانی پەخشانی کورد-یش وەکو بەشەکانی پەخشانی ئەوروپی لێهات، کە ئەتوانین هەموی بخەینە ناو چوارچێوەی ئەو چوار بەشەی ئەوروپیەکانەوە. وەکو: مێژو، چیرۆك، زمانپاراوی و نامەکاری. بەشەکانی تریش هەر هەن بەڵام ئەچنە پێستی ئەمانەوە. لە پاش لێبونەوە لە هەمو باسی پەخشان لە لای نەتەوەکانی دراوسیێ، بە دور و درێژی لە بەشەکانی پەخشانی کوردی- بەتایبەتی- و ناساندنیان قسەئەکەین.

***6-پەخشان و گۆرانی:***

بەر لەوەی دەست بکەین بە باسی پەخشان و پەیدابونی گۆڕانی لە لای کورد، پێویستە ئەو زنجیرە گۆڕانانە کە لە پەخشانی دراوسێکانا- بە تایبەتی عەرەب و فارس- تا ئەندازەیەك بزانین، چونکە پەیوەندی دراوسێتی و ئایین و زمان، ئەم ئیشەمان بۆ دێنێتە پێشەوە.

***1-لای عەرەبەکان:***

***ا-سەردەمی پێش ئیسلام:***

لەگەڵ ئەوەشا کە مێژونوسانی زمان و ئەدەبی عەرەبی، چ لە خۆیان، چ لە موسوڵمانەکانی تر، چ لەو رۆژهەلاتی ناسانەش کە لە ئەدەبی عەرەبی دوواون تا رادەیەك لەسەر ئەوە رێك کەوتبون کە عەرەب(قەواڵە)و سەنەدی ئەدەبی و رامیارییان نەبووە تا سەردەمی پێغەمبەر- درودی خوای لەسەر بێت- زیندوی کردنەوە.

هەندێك ئەڵێن هۆی ئەم باوەڕە ئەوەیە: ویستویانە ئەوە بچەسپێنن کە ئایینی ئیسلام توانی پێیان بگەیەنێت و لە تاریکیی دواکەوتن رزگاریان بکا. ئەمەو جگە لەمەش دو دڵ بوون لەو بەرهەمە ئەدەبیانە کە دراونەتە پاڵ سەردەمی ئیسلامی. بەڵام دوای ئەمە دەستەیەك هاتنە کایەوە وتیان:

هیچ گومان لەوەدا نیە کە(قران)خۆی لە هەناسەی سەردەمی جاهیلی دا هاتوە، کە هاتویشە، بۆ ئەو کۆمەڵە و بەو زمانە هاتوە کە ئەوان قسەیان پێکردوە. کەواتە قسەڕەوانیو زمانپاراوی و رازاوەیی و هونەر بەرزیەی لە ئەدەبی قران دا هەیە، نابێت کۆمەڵێك هاتبێت کە لەپێش ئەودا هیچ بەرهەم و چێژکەیەکی ئەدەبی نەبو بێت.

ئەم باوەڕە و لەگەڵ ئەو باسەدا کە عەرەب زۆر حەزیان لە مێژو، چیرۆك و راز ونیاز کردوە و چەند پەندو قسەی نەستەقیان بووەو لەکاتی شەڕا بۆ هاندان(دوان)یان داوە، ئەمانە هەمو لە لایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندییان بە ئاڵو گۆڕی ئابورییان لەگەڵ رۆم و حەبەش و ئێرانیەکان دا، کە بەتایبەتی ئەمانەی دوایی بون بە هۆی ئەوە کە عەرەبەکان گەلێك هونەری ئەدەبی و ئابوری و شەڕ لێیانەوە فێر بن.

جگە لەمانەش، لە قران دا باسی زۆر شتی کردوە. وەکو دەربارەی ژیانی(مکەو مدینە) لەڕوی ئابوری و ژیانی کۆمەڵاتییەوە. دیسان چۆن ئەمە هەیە ئەوەش هەر پیشان دەدات کە تاڕادەیەك لە پێش هاتنی قران دا نوسین هەبوە. ئیتر ئەو نوسینانە هەر چۆن بوبن ئەتوانین بە سەرەتای پەخشانی ئەوانیان دابنێین. وەکو لە سورەی(البقرە) لە ئایەتی (282)دا ئەڵێت:

**(یا ایها الذین امنوا اذا تداینتم بدین الی اجل مسمی فاکتبوه، ولیکتب بینکم کاتب بالعدل ولا یأب کاتب ان یکتب کما علمة اللە..).**

یا هەر لەو سورەتە لە ئایەتی 283 دا ئەفەرموێت:

**(وان کنتم علی سفر ولم تجدوا کاتبا فرهان مقبوضة)**

بە مانەدا کە وتران دەردەکەوێت کە عەرەب لە پێش ئیسلامدا بەپێی ئەو هۆشە سادەیە کە هەیانبوە پەخشانیان هەبوە. و ئەو پەخشانەش کە هەبوە کەم بووە، بەڵکو بە زۆری پەندو نەستەق بووە. و ئەو بەرهەمەی کە پەخشانێکی رازاوەیە و بە هی پێش ئیسلام لە قەڵەم دەدرێت، و یا دراوە، زۆری لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسیدا دروستکراوە. ئەمەش لەبەرهۆی ئایینی و رامیاری بووە، چونکە گومان لەوەدا نیە کە زۆر لەو دوان دانانەو قسانەی کە نوێنەرانی عەرەب لای کیسرا کردویانە، هەموی بە دروستکراو دادەنرێت.

لەبەرئەوەی کە قران، خۆی وێنەیەکە لە پەخشانی هونەری و بۆ خەڵکێك هاتووە لەو سەردەمەدا کە جاهیلی بوون، ئەتوانرێت وەکو بە بەرهەمێکی ئیسلامی دائەنرێت، بە بەرهەمێکی پێش ئیسلامی-ش دابنرێت لەڕوی ئەدەبەوە. ئەبێت ئەوەش بزانرێت ئەو شێوە زمانەی پێش قران ئەوەندە جیاوازی نیە لەگەڵ هی قران دا.

***ب-سەردەمی ئیسلامی:***

لەکاتێکدا پیغەمبەر(د.خ) هاتە ناوەو دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی ئایینەکەی، لەگەڵ ئەو دەسپێکردنەی ئەوا باری کۆمەڵایەتی و ئابوری و رامیاری تریش بە تەواوی گۆڕا. شان بەشانی ئەمەش ئەتوانین بڵێین باری ئەدەبی-ش گۆڕا هۆنەران و نوسەرانی سەر بە ئیسلام دەستیان کرد بە ستایشی ئایینی نوێ و هاندانی مەردم بۆ چونە ناویەوە. هونەر و نوسەرانی بوتپەرستانیش بە پێچەوانەی ئەمان ئەوانیش کەوتنە جم و جۆڵ، هەر لەم سەردەمەدا گەلێك نوسەرانی تر هاتنە کایەوە. ئەمانە هەمو بون بەهۆی دەوڵەمەندی ئەدەبی ئەو سەردەمە بۆ پاشەرۆژیان. بە تایبەتی ئەوانەی کە شتی پێغەمبەر(د.خ)یان دەنوسیەوەو نوسەری ئەو بون، هەروەها ئەوە بو هەر لەم سەردەمەدا گەلێك پەیمان و نامە، چ بۆ سەرۆکی هۆزەکان، چ بۆ، شا و سەرکردەی کیشوەرە دراوسێکان- کە هەندێکیشیان جێی گومان و وردبونەوەیە- نوسرا.

لەگەڵ ئەمانەشا قسەی پێغەمبەر(حدیث)-کەتەواوکەرو رونکەرەوەی قرانە- هاتە ناوەوە. پاش ئەوە نوسراو نامەی خەلیفەکان بۆ سەرکردەکانیان. شان بەشانی ئەمانەش دواندان گەلێك دەوری گێڕایەوە. وەکو(خطبەی حججة الوداع)ی پێغەمبەر، وە دواندانی خەلیفەکان، بە تایبەتی هی ئیمامی عەلی.

***ج-سەردەمی ئەمەوی:***

سەردەمی ئەمەوی ئەو باوەڕەی کە لە سەردەمی ئیسلامی-پێش ئەوانا هەبو گۆڕا، چونکە گەلێك پارت و کۆمەڵی جیاجیا هاتنە ناوەوە. هەروەها لەم سەردەمەدا هۆنەر و نوسەران زیاتر باویان

سەند هۆی باوسەندنەکەشیان زیاتر ئەوە بو کە خەلیفەکان لایەنیان ئەگرتن بۆ ئەوەی ستایشیان بکەن، کە ستایشکردنی کەسان لەو دەورەدا هێزێکی زۆر گەورە بو بۆ ستایشکراوەکە.

جگە لەمەش باری کۆمەڵایەتی گۆڕا و رادەی شارستانێتی پێشکەوت، زۆر شتی وا هاتە کایەوە کە هونەری هۆنراو وپەخشان بە هۆی (ڕەوانکاری و جوانکاری)یەوە هەنگاوی زل زلی نا. کاروباری میری-ش وای لێهات ناچاری دەواوین و دەفتەری دیوانی بو. نزیکترین دیوانێك بۆ ئەم بارەگایە دیوانی ئەدەبی بو، کە پێی ئەوترا دیوانی نوسین و نامە. ئەمە بو بە هۆی هێنانە ناوەوەی جۆرێکی تازە لە پەخشان و پێی ئەبێژرا پەخشانی هونەری کە لەوەوپێش عەرەب نەیئەزانی. ((عبدالحمیدی کاتب))بە دامەزرێنەر و وەستای نوسینی هونەری، واتە پەخشان ئەزانرێت، کە ئەم پیاوە بەرزە ئێرانی رەگەز بو.

لەگەڵ ئەمەشا بە هۆی پەیدابونی کاروباری رامیاری و ئایینی و هۆشییەوە دوواندانیش لەم سەردەمەدا باوێکی چاکی پەیدا کرد. هۆی ئایینی لە پێشتریشا هەر هەبو. هۆی رامیاری لەبەر زۆربونی پارت و دوژمنایەتی بنەماڵەی عەلەوی لەگەڵ ئەمەویدا. لە بن دەست ئەمەوە شعوبیەتیش کارێکی گەورەی کرد. و هۆی هۆشی- ش بە هۆی ئەو زانیاریانەوە کە لەبێگانەوە وەریان گرت.

بۆ ئەم پەرەسەندنی پەخشانی هەموو جۆرەی هونەریە، غەیری عەرەبەکان دەستێکی باڵایان هەبو.

*د-سەردەمی عەبباسی:*

ئەوە بو دوا بەدوای ئەمەویەکان عەبباسیەکان هاتنە پێشەوە، بەغدا لە باتی شام کرا بەپایتەخت. ئەمەش لەبەرئەوە بو کە هەتا ئەهات زۆرتر شت ئەکەوتە دەست ئەو ئێرانیانە کە نزیکی کۆشکی خەلافەت



بون. دەوری ئەبو موسلمی خوراسانی، و یا لەدەوری زێرینی عەبباسیەکانا، بەرمەکیەکان ئەم ئاگاداریەمان ئەدەنێ.

ئەمەو دیسان خەلیفەکانی عەبباسی وەکو پادشاکانی ساسانی هەمو وەزیر و پەردەداریان هەبو، کە ئەم وەزیر و پەردەدارانەش سەربەخۆ بۆ خۆیان کۆشك و دیوانی تایبەتیان هەبو.

پێشکەوتی ئێرانیەکان لە هەموو کاروبارێکا بو بەهۆی ئەوە کە لە نێوانی عەرەب و مەوالیەکان(غەیری عەرەب)بەربەرەکانێ پەیدا ببێت و دەنگی شعوبیەت- کە عەرەبەکان ئەم ناوەیان بۆ دانابو- زۆرتر بەرز ببێتەوە!!.

ئەوە بو زۆر لە زانایان و نوسەرانی ئێرانی- دەستیان کرد بە ستایشی خۆیان و قسە وتن بە عەرەب. لەبەر ئەمە گەلێك کتێبی هەمە جۆرە هاتە ناوەوە دەربارەی عەرەب، هەندێکی بە چاکی و ستایش، هەندێکی بە پێچەوانەی ئەمە. و هەروەها فرە لە ئێرانیەکان دەستیان کرد بە گۆڕینی سامانی ئەدەبی ئێرانی بۆ سەر زمانی عەرەبی. وەکو (ابن المقفع) کە گەلێك کتێبی هیندی و فارسی هێنایە ناو زمانی عەرەبییەوە.

ئەم کارە بو بە هۆی ئەوە کە ئەدەبی عەرەبی دەوڵەمەند بکا بەو شتانەی کە لە ئەدەبی هیندی و فارسی هەبون. و لە هەمانکاتا زانیاری یۆنانی-ش هەر ئاوێتەی عەرەبی کرا.

ئەمانە بون بە هۆی ئەوە کە ئەدەبی عەرەبی تێر بکا و ببێ بە هۆی ئەوە کە پەخشانەکەشی زیاتر تێراو بکاو شێوەی بێگانەی بچێتە ناوەوە.

جا لەبەر ئەمە پەخشان زیاتر لەم سەردەمەدا گەلێك لکی لێبوەوە. وەکو: پەخشانی زانستی، فەلسەفی، مێژویی.... هتد.

*هـ-سەردەمی مەغۆلی:*

لەبەرئەوە کە لەم سەردەمەدا وڵاتی پان و فراوانی ئیسلام پچڕ پچڕ بو، و میرو

فەرماندار ئێجگار زۆر بو. ئەم روداوانە بو بەهۆی ئەوە کە نوسینی ژیاننامە، واتە ژیانی تاکە تاکەی فەرمانداران بێتە ناوەوە. لەم سەردەمەدا زیاتر ئەم جۆرە پەخشانە باوی سەندو باوی هەبو!.

***و-سەردەمی عوسمانی:***

هەر وەکو مێژو و ژیانی کۆمەڵایەتی تێکچو و ئاڵۆزا، ئەم ئاڵۆزاویە دەستی خستە ناو ئەدەبیشەوە. لە سەرەتای ئەم سەردەمەوە ئەدەب بە هەموو لکاکانیەوە هەتا ئەهات هەر کز و سیستر ئەبو. بەڵام لە نزیکی دوایی هاتنی ئەم عوسمانیانەدا وردە وردە دەستی کردەوە بە بوژانەوە.

***ز-سەردەمی نوێ:***

ئەمیش دوای شەڕی گەورەی یەکەم(1914-1918) دەست پیٚ ئەکات، ئەدەبی عەرەبی لەم سەردەمەدا- بە زۆری مەبەستمان: عراق، شام، میسرە- دەستی کرد بە بوژانەوەی تێکەڵ بون بە ئەدەبی جیهانی، بە تایەبتی ئەوروپیەوە.

ئەمەش بە هۆی گۆڤارو رۆژنامە و وەرگێڕانی هەمو جۆرە بۆ سەر زمانی عەرەبی. و بەرهەمی ئەو رۆشنبیرانە کە لە ئەوروپا ئەیانخوێند و ئەگەڕانەوە بۆ وڵات. لەبەر ئەوە ئەبینین- بەتایبەتی لە پەخشانا- رێگای ئەوروپیەکان گیرا. وەکو لە باسی بەشکردنی پەخشانا ئەمەمان بۆ دەرکەوت.

***2-لای ئێرانیەکان:***

***کوردو فارس***

ئەدەبی کوردی فارسی- هۆنراو بیٚ یا پەخشان- هی پێش سەردمی ئیسلامی ناتوانین جیایان بکەینەوە و هەر یەکە سەربەخۆ باسیان بکەین، چونکە کارەساتی زەمان وەکو گەلێك شتی هاڕیوە، ئەم دوەشی بەو جۆرە هاڕیوە!.

ئێمە کە ئەڵێین ئێران و ئەدەبی ئێرانی، هی (ماد)بێت، یا هی (هەخامەنشی))، یا هی دوای ئەوان، و یا هی پێش ئەوان. نە ئێمە و نە ئێرانیەکان خۆیان، شتێکی راست و رەوان و دور لە ئەفسانە- بە تایبەتی هی پێش سەردەمی ماد و هەخامەنشی- بە دەستەوە نیە، چونکە پەلامارەکەی ئەسکەندەر ئیشێکی وای نەکرد کەلەپورێك بهێڵێتەوە بۆ نەتەوەکانی ئێرانی بۆ ئەوە بتوانن لە پاشە رۆژا بە جۆرێکی راستی بیگرن بەدەستەوە!.

ئەو لێشاوە وەکو حوکمی سیاسی تێکدا لە ئێرانا حوکمی ئەدەبی-شی هەر بەو جۆرە تێکدا. بە تایبەتی لە باری ئەدەبەوە هەر شتێك بوترێت بۆ پێش سەردەمی مادو هەخامەنشی هەموی ئەفسانەیە و دەست هەڵبەست!.

پاش ئەو مێژووانەش، مێژوی ئێران- هی هەموو بارێکی- هەر ئەگەڕێتەوە بۆ قسەی مێژونوسانی یۆنانی، واتە سەرچاوەی مێژونوسانی ئێرانی، هەموی هەر بە بەڵگەی یۆنانی باس ئەکەن. ئەگەر قسەکانی (هیرودۆت)و(سترابۆن) نەبێت بەدەستەوە، ئێران جگە لە(کەتیبە)و نوسراوی سەر بەردەکان هیچی تریان بەدەستەوە نیە!.

گومانیش لەوەدا نیە دەوڵەتە بە شوێن یەکدا هاتوەکانی ئێرانا نابێت هیچ بەڵگەو کە لەپورێکیان بەجیٚ نەهێشبێت بەڵام ئەو هێرشە هەموی لەناودا، و یا ئەتوانین بڵێین بەشێکی زۆریان برد بۆ خۆیان، پاشان مێژونوسەکانیان کەوتنە ناویەوە بۆ قسەکردن لێیانەوە، کیشوەرەکانی ئێرانیش ئەو هەناسەیانە نەما کە بتوانن سەر لەنویٚ شت پێکەوە بنێن، بە ناچاری پەنایان بردەوە بەر ئەو شتانە کە مێژونوسەکانی یۆنانی بۆ ئەمانیان ئەگێڕایەوە. تەنیا قسەکانی(حسن پیرنیا- مشیر الدولە)بەڵگەیە بۆ ئەم قسانە کە ئێستە ئێمە ئەیلێین!.

لە پاش سەردەمی ئیسلامی-ش دیسان ئەو کەلەپورەی کە لە بەینی (331)ی پێش میلاد، تا نەمانی یەزد گورد(652)ی میلاد، واتە ماوەی (983)ساڵ پێکیانەوە نابو، ئەویش دیسان لە پاش سەرکەوتنی ئیسلام بە سەریا لە ناو چو.

کەوا بو ئەو بەڵگانەی کە مابوبێتەوە بۆ ئێران- هی ئەو سەردەمانە- بە هەر بارێکا بێت یا گێڕانەوەی مێژو نوسانی یۆنانی و عەرەبە، یا کەتیبەو نوسراوی سەر بەردە کێلەکانە. لەمە زیاتر هیچی تر نەماوەتەوە. وا دیارە رەوشتی کەون هەروا بووە، هەر دەستەیەك هاتۆتە پێشەوە بەڵگەو شوێنەواری دەستەی پێشوی لەناوداوە!.

***

ئەوە بو وتمان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی فارسی پێش سەردەمی ئیسلام ناتوانین لێکیان جیا بکەینەوە، بۆیەش ئەمە وایە چونکە مادەکان کە باپیرە گەورەی کوردەکانن و ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیان لە وڵاتی ئێرانا لە (700-550)ی پێش میلاد دامەزراند، و نەبێت هەر بە تەنیا ژیابن، بەڵکو لەگەڵ خزمە پارسەکانیان لە لایەن زمان و ئەدەبەوە ژیاون.

هەروەها کە پارسەکانیش کیشوەری هەخامەنشی- یان دامەزراند و مادو هەمو ئێرانیان خستە ژێر دەست، ئەوانیش و نەبێت هەر بەتەنها ژیا بن و ئەدەب و شێوە زمانی مادیان لەناو بردبێت، چونکە ئاوێستا، کە نمونەشە بۆ ئەدەبی ئایینی ماد، لای هەخامەنشیەکانیش هەر باو بووە. ئەمجا ئەگەر وردە وردە سەرەوخوار ببینەوە سەردەمی ساسانیمان دێتە بەردەم، لەم سەردەمەشا ناتوانرێت بوترێت ئەو ئەدەب و زمانەی تیادا باو بووە تەنیا فارسی، و یا کوردی بووە، بەڵکو ئەبێت بوترێت ئەدەبی سەردەمی ساسانی- کە هی نەتەوەکانی ئێرانە- کورد و فارس بە تایبەتی هاوبەشیان تیایا کردوە.

جگە لەمەش وەکو زانایانی پەهلەوی ناس دەری ئەخەن نزیکی زمانی کوردی و بە تایبەتی لەگەڵ پەهلەوی دا گەلێك زیاترە لەهی فارسی.

کەواتە ئێمە بۆ ئەوەی دەربارەی پەخشان و گۆڕانی پەخشان شتێك بزانین- چ لەلای کوردو چ لەلای فارس- پێویستە دراسەی پەخشان بکەین، هی سەردەمی

پێش ئیسلام، بە چاوی هاوبەشی دایبنێین، و یا ناوی بنێین پەخشانی ئێرانیەکان.

جا لەبەر ئەمەیە لێرەدا ئێمەش لە زۆر کۆنەوە دەستی پێ ئەکەین تا ئەگەینە سەردەمی ئیسلامی، ئەوسا هەریەکە لە فارسی و کوردی ئەدەبەکەی وردە وردە لە یەك جیا ئەبێتەوە و تایبەتی سەردەم و زمانی دەورو پشتی خۆی وەرئەگرێت.

بۆ ئەوەی زنجیرەی باسەکەمان لێ نەپچڕێت وئەهێنین هی سەردەمی پێش ئیسلام ئەکەین بە چەند بەشێکەوە، وە بەپێی توانا باسی پەخشان و ئەو زمانەی کە پێی نوسراوە لەو بەشەدا لێی ئەدوێین. ئەگەر دەستیشمان کەوت وێنەشیان بۆ ئەهێنینەوە.

## *1–سەردەمی پێش ئیسلام:*

### *پێشەکی بە کورتی :*

ئێرانیەکان لە نەژادی ئاری–ن، لە دەوربەری دو سێ هەزار ساڵی پێش میلاددا سەرەوخوار بونەتەوە بۆ ئەو خاکی ئێرانە. کۆمەڵێکیان لە سەرو و سەروی رۆژاوادا جێ نشین بون(ماد) یا پێ ئەڵێن. کە کۆمەڵەکەی تریان لەلای خوارووە جێ نشین بوون (پارس)یان پێ ئەوتن.

سەردەمی ماد:

وەکو مێژو باسی ئەکات(دیائاکو)وەیا(دیوکس) دامەزرێنەری کیشوەری(ماد)و یەکەمین پادشایە کە(هەمەدان)ی کرد بە پایتەخت. بنەماڵەی ماد(150)ساڵێك فەرمانڕەوایی وڵاتی ئێران و کوردستانیان کرد، توانیان کیشوەری ئاشور–یش بڕوخێنن و ببنە یەکەم فەرمانڕەوا لە وڵاتی ئێران و کوردستان دا.

لەبەر نەپشکنین و کەمتەرخەمی تا ئێستە شتێ کە لە بارەی پادشاکانی مادە وە ئەگەر نوسراو بێت دەست ئێمە نەکەوتوە تا بتوانی بە تەواوی لە زمان و نوسینیان ئاگاداری پەیدا بکەن. بەڵام بە پێی ئەو باوەڕەی کە هەندێك شارەزایانی بێگانە دەریان بڕیوە ئەڵێن زمانی ئاوێستا ئەو زمانەیە کە زەردەشت کتێبە پیرۆزەکەی پێداناوە، هەمان زمانی مادەو ئەو زمانەیە کە لە وڵاتی ماددا بەکار هاتووە. جگە لەمەش ئەڵێن زمانی ماد لەگەڵ زمانی فارسی کۆن جیاوازییەکی وایان نەبووە، چونکە مێژونوسەکانی یۆنان ئەڵێن: پارس و مادەکان لە یەك گەیشتوون.

دیسان زاناکان ئەڵێن: زمانی ماد، سانسکریتی و فارسی کۆن سێ زمانی دەستە برا بوون و لە دایکە زمانێ زاون کە ئەویش زمانی ئارییە.

کەواتە ئێمە وەکو وتمان و ئاشکراشە کە ئەدەبی سەردەمی ماد لە ئەدەبی ئاوێستا دایە. ئەوە ئەمێنێتەوە کە ئایا لەو سەردەمەدا پەخشان هەبووە؟. و کە هەبو بێت چۆن بووە؟.

ئەڵێن هەرچەندە نوسراو و پاشماوەی سەردەمی پادشاکانمان بۆ نەماوەتەو، بەم بەرهەمەکەی ئاوێستا هەروەك بۆ هۆنراوە پەکینەخستین، لە پەخشانیشا ئەکەوێتە فریامان، چونکە لە(ها–فەسڵی)(ئەهنودگات– ئوشتودگات)دا حەوت فەسڵ هەیە لە ئاوێستادا، لە بەرگی (یەسنا)، کە بە ئاوێستایی(هیتنگ هائیت)ی پێ ئەڵێن، لە نوسین و شێوەی زماندا وەکو (گات)ەکان وایە، شەش فەسڵی پەخشانە.

کەواتە ئەمە یەکە نمونەی پەخشان بۆ هی سەردەمی زۆر کۆن– سەردەمی ماد–.

## *سەردەمی هەخامەنشی:*

### *330-550 پێش میلاد.*

کورش–ی هەخامەنشی دوای داگیرکردنی هەمەدان– ئەکباتان–، بە ناوی پادشای هەخامەنشیەوە هاتە ناوەوە. ئەگەر جیاوازیەك هەبو بێت لە نێوانی ماد و هەخامەنشیدا،– بەڵام وەکو هەندێك ئەڵێن– ئەتوانین بڵێین فەرمانڕەوایی لە خانەوادەی مادەوە چو بۆ خانەوادەی هەخامەنشی، و هاتنی کورش ئەوە ناگەیەنێت کە مادەکان نەما بن و لەناو چو بن، بەڵکو تەنیا پادشایەتیان لە دەست چو. ئێمە لەبەرئەوە کە هەخامەنشی بە درێژبونەوەی فەرمانڕەوایی ماد ئەژمێرین و لەبەر ئەوەی جیاوازیەکی ئەوتۆیان نەبووە. شتێك دەربارەی ئەدەب لەم سەردەمەدا– بە تایبەتی پەخشان– باس ئەکەین:

ئەو زمانەی کە لەم سەردەمەدا باو بووە زمانی فارسی کۆن بووە، وەکو وتمان ئەمە دەستەبرای زمانی ئاوێستایی بووە. هەندێك ئەڵێن ئەم زمانە لە دوا سەردەمی هەخامەنشیدا زمانی فەرمان و نوسینی سەر لەوحەکان بووە، زمانی پەهلەوی زمانی قسەکردنی ناو خەڵك بووە.

### *پەخشان، مێژوو، دووان:*

شێوەی نوسین و داڕشتنی پەخشان و نوسینی ئەم سەردەمە لەو لەوح و بەردە نوسراوانەدا دەرئەکەوێت. جگە لەوەش دیسان هونەری مێژونوسی لەو تەختە بەردە نوسراوانەوە هەر دەرئەکەوێت، بەتایبەتی تەختە بەردەکەی (بێستون)کە لە داریوشی گەورەوە بەجێ ماوە و بەسێ شێوە زمان نوسراوەتەوە، ((فارسی کۆن، ئێلامی و ئاسوری))، و بەخەتی مێخی هەڵکەنراوە و بە کوردی ئەمەیە گوزارشتەکەی:

_داریوش ئەڵێت: ئەمەیە کە من کردم دوای ئەوەی بوم بە پادشا. هەبو کەمبوجیە کوڕی کورش لە بنەماڵەی ئێمەیە..)).

جگە لەمەش تەختە بەردەکەی تەختی جەمشیدە، کە دەربارەی داریوش شایە. وەرگێڕانەکەی بە شێوەی کوردی ئەمەیە:

_داریوش پادشای گەورەی هەمووپادشاکان کوڕی ویشتاسبی هەخامەنشییە)).

(داریوش شا ئەڵێت: ئەمەیە کیشوەرێ کە من هەمە، لە سکاها کە لە پشت (سفد)ەوەیە تاکو کوش حەبەشە).

(لە هندەکانەوە تا(سپەرد–سارد)کە بەمن ئاهورامزدا گەورەترین خواکان بەخشیویە. ئاهورامزدا من و بنەماڵەی من نگاداری بکا).

هەروەها ئەوەش هەر هەیە کە هونەری دووان دان باوی بووە، چونکە زەردەشت بە

هۆی دووان دانەوە خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ سەر ئایینەکەی خۆی، دوای ئەویش موغانەکان لەو سەردەمەدا هەمان شتیان بەکار ئەهێنا، و بەهۆی وتوێژەوەو دوان دانەوە کاریان کردۆتە سەر مەردم.

***سەردەمی کزبونی ئەدەب:***

***سەردەمی ئەشکانی (331-226)پێش میلاد.***

ئەم سەردەمە لە روخانی هەخامەنشی بە دەستی ئەسکەندەرەوە لە (331)ی پێش میلادەوە دەست پێ ئەکات تا هاتنی ئەردشێری پاپەکان لە (226)ی پێش میلادەوە.

ئەم ماوەیە بە سەردەمی کزبون و دواکەوتنی ئەدەب و هەمو زانیاری و زانیاریەك ئەژمێررێ. دەربارەی زمان لەم سەردەمەدا گەلێك باوەڕ هەیە:

هەندێك ئەڵێن زمانی میری یۆنانی، و یۆنانی و ئێرانی بووە. و یا زمانی(دەریْ)بوە- کە ئەم دەریْیە زۆر نزیکە بە شێوەی کوردی ئێستەوە-. هەندێکی تر ئەڵێن: زمانی(پارتی) بووە، کە ئەم پارتییە تێکلاو بووە لە مادی و پارتی، و زمانی پەهلەوی بەوە دائەنێن.

بەڵام باوەڕێ کە لەم دواییەدا بۆ هەندێ لە زانایان پەیدا بو ئەوەیە کە زمانی ئەشکانیەکان پەهلەوی بووە، ئەوەندە هەیە ئەم پەهلەوی ئەشکانییە لەگەڵ پەهلەوی سەردەمی ساسانیدا جیاوازییان هەیە. لەگەڵ ئەمەشا لە راستیدا هەردوکیان هەر زمانێکن ئەکەونە نێوانی زمانی کۆنی ئێرانی و شێوە زمانەکانی ئێستای.

هەندێ (دراو)ی سەردەمی ئەشکانی کە دۆزراوەتەوە بە خەتی ئارامی وشەی پەهلەوی لەسەر نوسراوە، لەوانەش وەکو دراوەکا میهردادی چوارەم.

دەربارەی ئەدەب و زانست لەم سەردەمەدا ئەمەندە گوێیان نەدواەتێ، جگە لە(بلاش)ی یەکەم نەبێت کە ویستی ئاوێستا کۆبکاتەوە بەڵام بە هۆی هەندێك پێشهاتەوە ئەوەشی بۆ نەکرا.

لەسەر بیروڕایەکی تر کتێبی(کلیلە و دمنە)و(سەندباد)لە پاشماوەی ئەشکانیەکانە. ئەبێت ئەوەش بزانین کە موغانەکان لەو سەردەمەدا دانشمەند و خوێندەوار بوون.

***سەردەمی ساسانی***

226 پێش میلاد (650) پاش میلاد

دوای روخانی ئەشکانیەکان و دامەزراندنی کیشوەری ساسانی بە دەستی ئەردشێری پاپەکان ئەستێرەی ئاسمانی بەختی ئێرانیەکان کەوتەوە جریوەو ئیتر دەستی کرد بە درەوشانەوە. ئا لەم سەردەمەدا نەك پەخشان، کە لکێکی ئەدەبییە، بەڵکو هەموو جۆرە زانست و هونەرێك پێشکەوت. ئێمەش بە کورتی باسیان ئەکەین:

***1-خەت***

خەتی سەردەمی ساسانی خەتی پەهلەوی بووە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو تەختە بەردە نوسراوانە و ئەو شوێنەوارانەن کە بەجێ ماون، چونکە وەکو زانیمان (خەتی مێخی پارسی)لەسەردەمی ئەسکەندەری و ئەشکانی دا وردە وردە کردە ڕووی نەمان، ئێرانیەکان ئاشنا بون بە خەتی ئارامی.

خەتی پەهلەوی سەردەمی ساسانی بریتی بوو لەو خەتەی کە لە ئارامییەوە وەریان گرتبو، کە ئەمەش دو جۆر بو، خەتی پەهلەوی کلدانی- کە لەبەینی عراق و شامدا بو-. خەتی پەهلەوی ساسانی، هەر دو جۆرەکە باوی هەبو. خەتی پەهلەوی گەلێك گیروگرفتی تێدا هەیە.

یەکێ لەوانە ئەوە بو کە ریزێکی بە سنوری نەبو، وەکو ئەوە کە بۆ هەردەنگێ لەو زمانی پەهلەوییەدا نیشانەیەکی وا نەبو کە دەنگەکە جیابکاتەوە لەشتی تر، بەڵکو زۆرجار یەك نیشانە بۆ چەند دەنگێ بەکار هاتووە. هەرچەندە(25)پیت نیشانە بووە، بەڵام لەراستیدا بۆ خوێندنەوەی ئەم خەتە تا هەزار پیت پێویست بووە!. لەبەر ئەمەیە کە بە تەواوی ناتوانرێت دان بە پەهلەوی ناسەکانی ئەم سەردەمە دابنرێت کە گوایە ئەتوانن وەکو هی سەردەمی ساسانی بیخوێننەوە.

یەکێکی تر لەوانە ئەوە بووە کە ئێرانیەکان لەو سەردەمەدا دو شێوە نوسینیان هەبوە، یەکێ(هەزوارش)یا(زوارش)ی ناو بوە. ئەمەیان وەکو نوسراوەکە نەخوێنراوەتەوە، ئەم وا نەخوێندنەوەش لەبەر ئەوە بووە کە وشەی سامی تێکەڵ بووە، بەڵام وشە سامیەکانیان بە پەهلەوی خوێندۆتەوە.

بەوێنە نوسیویانە(ملکان ملکا، شمسا، سنە)) کەئەمانە سامی-ن، لە خوێندنەوەدا بە(شاهەنشا، ئافتاب، ساڵ) خوێندویانەتەوە!.

ئەویتریان هەر خەتی ساسانی بووە وەکو نوسراوەکە خوێنراوەتەوە. ئەم خەتی ساسانیەش سێ جۆر بووە...

یەکێ نوسینی سەرتەختە بەردەکان و روی کۆشك و سەر دەروازەکان-کە ئەمە پێی ئەڵێن نوسینی سەر تەختە بەرد-. یەکێ خەتی نامەنوسین. سێیەم، نوسینێك بووە کەدایان هێنابو بۆ نوسینەوەی ئاوێستا. بەمەیان ئەوت ئاوێستایی.

ئەم خەتانە بە هەر دو جۆرەکەیەوە تا سەردەمی ئەمەوی باویان بووە، و لەزۆر جێگای ترا هەر بەکارهاتووە، بە تایبەتی لەناو پاسەوانی ئاتەشکەدەکانا. ئەڵێن لەسەر گومەزەکەی(قابوسی وەشمگیر)نیشانەی پەهلەوی هەیە.

ب- زمانێ کە لەم سەردەمەدا باو بووە و بەکارهاتووە زمانی پەهلەوی بووە. ئەم زمانە نە پارسی کۆن بووە، نە ئاوێستایی، بەڵکو زمانێك بووە لە ناوەندی زمان کۆنەکانی ئێرانی و زمانی ئێستا- کوردی و فارسی-دا وە زۆر لە تەختە بەردەکان و نامە و کتێب- هی ئەو سەردەمە بوون- بەو جۆرە زمانە نوسراونەتەوە.

لە بارەی واژەی پەهلەوییەوە گەلێك باوەڕ هەیە، گوایە پەهلەوی بە واتا، شارو شارستانیەکان بەو جۆرە قسەیان کردوە. و یا ئەڵێن: گوایە پاڵەوانان و گەورە پیاوان

بەوە قسەیان کردوەو زمانی ئاخاوتنیان ئەوە بووە. هەروەها (پەهلەو)بە مەعنا نەجیب و شەریفە.

(ابن المقفع) ئەڵێت: پەهلەوی ئەگەڕێتەوە بۆ (پەهلە)، کە ئەم پەهلەیە ناوی چەند شارێکی گەورە بووە لە ئێران، وەکو ((ئەسفەهان، رەی، هەمەدان و نیهاوەند)). ئەڵێت لەم شارانەدا ئەم زمانە باوی هەبووە.

هەندێکی تر ئەڵێن: پەهلەوی دو شێوە زمان بووە، یەکەم سەرو- ئەشکانی. دووەم، خوارو- ساسانی.

## *ج-پەخشان، دووان دان، مێژوو وپەند. لەم سەردەمەدا.*

بەڵگەو نیشانەی مێژوویی ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە ئێرانیەکان ئەم سەردەمە لەم هونەرانەدا دەستێکی باڵایان هەبووە. تەنانەت کە ئەوترێت عەرەبەکان لە جاهلی دا لە هونەری دووان داندا پێش کەوتبوون، هۆی ئەمە ئێرانیەکان بوون، چونکە شێوەی دووان دان قسەرەوانی لە ئێرانیەکانەوە بۆ ئەوان ماوەتەوە. زۆر لە نوسەرانی ئیسلامی دان بەمەدا ئەنێن. و پەند و قسەی نەستەق و پەخشان- مێژو چیرۆك- بەڵگەی مێژویی ئاشکرای ئەکات کە لەسەردەمی ساسانیدا زۆر باوو بە نرخ بووە. و گەلێك لە بەرهەمانە لەم سەردەمی ئیسلامیدا وەرگێڕوان.

هەروەها موسڵمانەکان، لە بارەی ئەدەب و پەندو مێژو و ئەستێرەژمێری سازو ئاواز، پەرمونەوەیان-اعتمادیان- کردۆتە سەر بەرهەمی ئێرانی سەردەمی ساسانی.

بەناوبانگیی کتێبی(کلیلەودمنە) و خستنە سەری دانە دەمی (برزویەی حەکیم)، و ئەو کتێبانەی تریش کە ئیشارەیان بۆ کرا، وەکو کارنامەی ئەردشێری پاپەکان، چیرۆکی بەزم و رەزم، وەکو چیرۆکی شیرین و فەرهاد کە بەڵگەن بۆ ئەو قسانە کە لەپێشەوە کردمان تا ئەندازەیەك کلیلن بۆ باسەکان.

## *وێنەیەك لە پەخشانی ئەم سەردەمە:*

ئەو بەردە نوسراوانە سەر کۆشکی سەردەمی ساسانیەکان، کتێبە پەهلەوییەکانی ئەو چاخانە نمونەی پەخشانی ساسانی پیشان ئەدەن. نوسراوەکەی ئەردشێری پاپەکان لە(نەخشی رۆستەم) مێژوی ئەردشێر پیشان ئەدات کە بەخەتی پەهلەوی کلدانی، و پەهلەوی ساسانی نوسراوە لەگەڵ وەرگێڕانەوەکەی بە یۆنانی:

(پات کارا زانا موزدیسن بغی ارتخشتر (مالکان مالکا) ئێرانا مینوچیتری من یزتان بارا پاپاکی مالکا).

واتە :

(ئەمە پەیکەری خواوەند- پادشا-ی خواپەرست ئەردشێر شاهەنشای ئێرانە، لە نەوەی ئاسمان لە یەزدان کوڕی پاپك پاشا)).

جگە لەمە لە کارنامەی ئەردشێری پاپەکانا سەر گوزشتەو کاروباری ئەردشێر ئەگێرێتەوە. ئەمەی خوارەوە پارچەیەکە لەو دەقە کە پەخشانی ئەو سەردەمە پیشان ئەدات:

_پاپك شبی خواپ دیت چیگون کی خورشیت رۆژ سەری ساسان برتافیت وهماك کیهان روشنیە کنیت. اپاریك شپ ایتون دیت چیگون کی ساسان پەپیلی‌ی ئاراستك ی سپیت نشست، ایستایش و ئافرین هماك کنیند)[1]

واتە

(پاپك شەوێك لە خەوا وای چاو پێ کەوت، کە رۆژ لەسەری ساسانەوە هەڵهات و هەمو جیهان روناك ئەکاتەوە)).

(شەوێکی تر وای دی کە ساسان بە فیلێکی رازاوە و سپی دانیشتووە لەسەری ئەو فیلەوە دانیشتوە- و هەرچێ مەردم لە کیشوەری ئەوا هەن بە دەوریا وەستاون، نوێژ بۆ ئەو ئەکەن و ستایش و ئافەرینی ئەکەن)).



1کارنامەی ئەردشێری پاپەکان ل3

**پەخشانی کوردی**

**لە سەردەمی ئیسلامیدا**

**لەوانەیە پەخشانی کوردی ئەم ماوەیە بکەین بە دو بەشەوە**

**ا . لەسەدەی حەوتەمی میلادەوە تا دوایی سەدەی نۆدەهەم**

**ب . لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم . کەسەرەتای بوژانەوە و سەرهەڵدانی پەخشانە . تائەمڕۆ**

ئەتوانین دان بەوەدا بنێین کەئەدەبی کوردی بە تایبەتی لە دوایهاتنی ئیسلام پەحشانی هەبووە بەلام پەخشانێك بەو واتایە کە هەمو تایبەتیەکی پەحشانی هەبوبێت ئەمەیان ناتوانرێ بچەسپێنرێ، بەڵکو ئەو چیرۆك و پەندی پێشینان و مەتەڵ ورازو نیازانەی کە بووە و دەماو دەم گەیشتوە بەئێمە و ئەنوسراون وبە تەواوی نازانرێ چۆن رێکخراون، بە بە رهەمی پەحشانی بەشی یەکەم دابینێن. وە یا ئەو دووان دان و قسەو هان دانەی کە لەکاتی شەڕوشۆری نێوانی هۆزەکان، وە یا نێوانی کورد و نەتەوە دراوسێکانی وترا ون و هەر چەندەش ئەکەوتونەتە سەر کاغەز.وە یا لەگەڵ ئەو داستان وچیرۆکە پەهلەویو فارس و عەرەبیانەی کە بە کوردی وتراون و نوسراون. ئەتوانین ئەمانە هەمو دابینێن بە پەخشان بۆ ئەو سەردەمانەی تیایا وتراون. هەروەها ئەو دووان دان و ئامۆژگاریانەی کە مەلا کان لە مزگەوت و شوێنە تایبەتیەکانا وتویانە وکردویانە بۆ کوردەکان لە کاتی کاروباری ئایینی و نوێژوجەژن دا. ئەمانە هەمو پەخشانی ئەو سەردەمانەمان بۆ دەور ئەکەنەوە

ئێمە ئەم قسانە ئەکەین و ئەم بەشکردنانە دێنینە ناوەوە بەرانبە بە ئەدەبی کوردی وپەخشانی کوردی. بەڵام بچینە سەر شتێکی راستی و ناوەرۆکەکەیەوە، کورد لە دولاوە لێ قەوماوە، لایەکی گشتی وەکو هەمو نەتەوەیەك. لایەکی تایبەتی کە ئەمەیان هەر بۆ کورد بووە .

گشتییەکە ئەوەیە کە ئادەمیزادەکە چەتونە، لە هەمو سەردەم و لاپەرەی مێژودا، دەستەیەکی سەرکەوتو، کە هاتووە هەمو کەلەپور و شوێنەواری دەستەی ژێرکەوتوی لە ناو بردووە. بەم جۆرە دنیا لە بەرەبەیانی مێژویەوە هاتۆتە خوارەوە.

هەر نەتەوەیەك کە ویستبێتی دەمێك بۆ کەلە پوری خۆی بەرێ، لە دووڕێگە بەولاوە هیچی تری نەبووە، یا ئەمەیە پەنای بردۆتە بەردەستەی سەرکەوتو، چی ئەوان دانیان پیا ناوە، ئەو ئەوەی هێناوە و کردویە بە بناغە بۆ دروستکردن وپێکەوەنانی شتی سەرلەنوێ بۆ خۆی.

یا ئەمە هەر بە تەخمین شتی دروستکردوەو ئەو دروستکراوەی خستۆتە سەر کاغەز– ئەگەر بوبێت–، لە پاش چەند بەرەیەك ئەو شتە دروستکراوە جێگای خۆی گرتووە، بۆ بەرەکانی دوایی بوو بەبنجێك و لەسەر ئەوە رۆیشتون و شتی تریان لێ زیاد کردوە.

بەڵێ!. دور نیە لەم رۆژەدا کە زانیاری گەیشتۆتە پلەیەك تەنانەت زانایان تەمەنی بەرد دەر ئەخەن، و لەسەر ئەو تەمەن دەرخستنە پلەی پێشکەوتن و پاشکەوتنی ئادەمیزادەکانی پێشو ئەدۆزنەوە.

و یا پسپۆڕان بەرد و بەڵگەی کۆن ئەدۆزنەوە و نوسراوێك ئەگەر بەسەریانەوە بێ هەڵیئەهێنن. بەڵام ئەمانە ئەو تینوێتییە ناشکێنن کە بە هەموو جۆر و لە هەمو رویەکەوە سەردەمی مێژوی ئەو بەردانە– کە چەرخ هاڕیونی– بۆمان رونبکەنەوە، هەر ئەوەندەیە سەرەدەزوییێکە و هیچی تر!.

لێرەدا جیایی لە نێوانی رۆژاواییەك و رۆژهەڵاتیەك دا نیە، هەردولا یان وەکو یەکن و هەردو لایان ئادەمیزادن، هەردو لایان ئەو سروشت و غەریزەیەیان تێدا هەیە.

کارەساتە سامناکەکانی رۆمان کە ئەیاننواند بە دەستە ژێر دەست، پیاو کە ئەیانبینێ و ئەیانخوێنێتەوە موچرکی پیا دێت. ئەو کردەوە ناهەموارانە کە شایەکانی کۆنی ئێران ئەیاننواند بەرانبەر بە ژێر دەستەوە بە دیل، ویژدان بێزی لێدێتەوە. سەرکەوتنی عەرەب بەسەر نەتەوکانی ترا کردەوەیان بەرانبەر بە غەیری خۆیان گەلێك باشتر بو لەو کردەوانە کە بەرانبەر بە خۆیان ئەیاننواند. ئەمەوی چی کرد بە عەلەوی؟. عەبباسی چی کرد بە پاشماوەی ئەمەوی بە بەرەی عەلەوی؟!.

لە سەدەکانی ناوەڕاست دا(محاکمی تفتیش))چی ئەکرد لە ئەوروپادا؟!. چەنگێز و مەغول چ کردەوەیەکی دڕندانەیان نواند بەرانبەر بەبەشەرییەت؟! لەم ئاخرەدا(جمعیتی اتحاد و ترقی)چ واوەیلایەکیان نایەوە؟!. دوێنێ هیتلەرو نازی بە چ جۆرە ئینسافێك لەگەڵ بە شەرییەتا جووڵانەوە؟!.

کەوا بو ئەمە کرد و کۆششی کەونە بەرانبەر بە شەرییەت، با کەس گلە نەکات!.

کورد بەو ناوەوە کە ئادەمیزادە، ئەویش لە لاپەڕەی مێژویا بەر ئەو لێشاوانە کەوتوە وەکو ئادەمیزادەکانی تر. ئەمە شتە گشتیەکە. ئەمجا تایبەتییەکە.

ئەگەر لێك بگەڕێن من کارەسات و حەقایقی مێژو باس ئەکەم و هیچی تر:

دامەزراندنەکەی، هەمو بە دڵێکی فراوان و بە هەموو ئارەزویەکیەوە باوەشی کرد بەو ئالایەدا، بە دڵ و بە گیان خۆی لە ژێر سێبەری ئالاکەدا حەسانەوە. لەو رۆژەوە چ بە شیر، چ بە قەڵەم خزمەتی ئەم دینە ئەکات تا ئەم رۆژە ئێمەی تێدایین. لە هیچ سەردەمێکا و لە هیچ رۆژێکیا بە جۆرێکی تێکڕایی لەو دو رێگایەدا درێغی نەکردووە و ناشیکا. بەڵام لە دوای سەردەمی عەبباسی بەربەرەکانێی حکوماتی ئێرانی و حکوماتی عوسمانی، کوردی لەو ناوەدا کرد بە ئاردی ناو دڕکان و کردی بە هەڵمات پێکیانا ئەدان!.

ئەمانە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە پابەندبونیان بە ئایینی ئیسلامەوە و خزمەتکردنیان بە علوم و زانیاری ئیسلامی

و زمانی عەرەبییەوە، ماوەی ئەوەی نەداون کە بە زمانەکەی خۆیان شتێك بنوسن و شتێك بهێڵنەوە. لەگەڵ ئەوەشا ئایینی پیرۆزی ئیسلام وە نەبێت دژی ئەم جۆرە شتانە بێت. بەڵکو گەورەتر بەڵگە بۆ بەرزی ئەم ئایینە و بۆ هاندانی ئەم ئایینە بۆ خوێندەواری و بۆ زانین یەکەم ئایەتی(قران)ە کە ئەفەرموێ:

((اقرا باسم ربك الذى خلق، خلق الانسان من علق، اقرا وربك الاكرم، الذى علم بالقلم، علم الانسان ما لم يعلم))

هیچ ئایینێك لە عالەما نەبو- ئاسمانی بوبێت، یا غەیری ئاسمانی- بەم جۆرە هانەهانەی خوێندن و خوێندەواری بدا.

و یا لە پاش سەرکەوتنی(بەدر)ئەمە گەورەتر بەهرەیەك بو بۆ ئیسلام کە پێغەمبەر- درودی خوای لەسەر بێت- بریاری دا ئەو دیلانە کە نا توانن خۆیان بکرنەوە، هەر کەسیان کە خوێندەوارن دە منداڵی موسڵمانەکان فێری خوێندەواری بکەن. ئەمە لە هیچ ئاینێکا بەم جۆرە تەشجیعی خوێندەواری نەکراوە.

ئەم گوێ نەدانەی کوردە بە نوسین بە زمانی خۆی من نازانم چ رێگایەکی بۆ بدۆزمەوە؟!. هەر ئەوەم بۆ ئەدۆزرێتەوە کە : بەشکراوی کورد بووە لەو ناوچانەدا و کشانی پەردەی تاریکی بووە بە سەریانا.

لە لایەکەوە ئێران فیکری گوشیون بەوە کە گوایە لەگەڵ کورددا بران و فەرقی چییە با نوسین بە فارسی بێت!. لە لایەکەوە حکومەتی عوسمانی بە ناوی ئیمپراتۆریەتی خەلافەتی ئیسلامەوە. ئەم ئیشەی کە ئەکرد، نەوەك هەر لەگەڵ کورد دا بو، بەڵکو لەگەڵ ئەو هەموو نەتەوانەشا بو کە لە ژێر ئاڵای ئیمپراتۆرییەتا بون، بە عەرەبیشەوە.

لە هەمو لایەکەوە رێگا لە کورد گیرا بوو بۆ ئەوەی بە زمانی خۆی بخوێنێ و شت بنوسێ و بیهڵێتەوە. تێکرای نوسین- تەنانەت نامەش- یا ئەبوایە بە زمانی فارسی بوایە، یا تورکی. بۆ خزمەتکردنی علومی ئیسلامیش، ئەوە بە عەرەبی بو.

بیرو فیکر وا گوشرا بو ئەگەر یەکێك کتێبێك، وە یا پەخشانێك، وە یا نامەیەکی بە کوردی بنوسیایە بێجگە لەوە کە خۆی ئەوەی بە دڵ نەدەهات، ئەبو بە جاری تیتاڵی لە ناو مەردمیشا.



لەبەر ئەم هۆیانە ئێمە ناتوانین پەخشانێکی رێك و رەوانی کوردی- کە نوسرا بێت- تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و بەڵکو نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە بێنینە دەست. لە ئیمرۆژیش بە دواوە نازانم ئەدۆزرێتەوە یان نە؟ بەلام بڕواشم نیە! چونکە یا فارسی، یا تورکییە، یا عەرەبی.

بەم هۆیەوە- کە قسە لە خوێندەواریەوە ئەکەم- دان بە دو شتدا ئەنێم" بە خۆڕایی کە بڵاوی کردۆتەوە و خوێندن کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی هەمو کەسێکەوە، ئەم هانەهانەدانەی لەگەڵ بیری سەرەتای ئیسلامیشا جوت ئەبێت.

دووەم ئەو ماوەیەی داوە کە کورد بە زمانی خۆی بنوسێت و هیچ بەرهەڵستێك نەیەتە رێی.

ئەوە بو لە پێشترا وترا پەخشانی کوردی لە پاش داهاتنی ئیسلام تا ئەگاتە سەدەی نۆزدەهەم، ئەوی کە بە دەماودەم مابوبێتەوە بریتی بو لە پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، مەتەڵ و چیرۆکی گوێ ئاگردان. کە ئەمانە بەرە بەرە کوردەکە بەسەر زاریەوە بووە و گێراوییەتەوە.

ئێستە دێینە سەر باسکردنی ئەوانە و هێنانەوەی دەق بۆیان. پاشان دێینە سەر باسی بەشی دووەم و جولانەوەی ئەو سەردەمە کە کوردەکە وەکو نەتەوەکانی تر راپەرینی ئەدەبی تێکەوت و ئەو بەشانە کە لە ئەوروپا و نەتەوەکانی تری رۆژهەلاتا پەیدا بو لەمیشا هاتە ناوەوە" وەکو:

وتار، نامە، چیرۆك بە مەفهومی تازە و پەیدابونی نوسینی پەخشان لەو رۆژەوە کە رۆژنامە و گۆڤار کەوتۆتە ناوەوە.

سەرچاوە:-

دەقەکان ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، (چاپکراوەکانی کوری زانیاری کورد، بغداد-1978.

# ئەدەبو رۆژنامە، رۆژنامەو لێکۆڵینەوە!

رۆژنامە پەردەیەکی رواڵەتی‌ی بەدیمەن بوو کە لە رۆژانی دوایی دا کەوتە بەر چاوو ئەدەبی تا پایەیەکی بەرز ئەوەندەی تر پیشان دا. رۆژنامە خۆی هۆیەك بوو لەو هۆیانە کە ئەدەبی پێ بەرز بوەوە بەڵام خۆی لە پلەی تازەی داهاتنەکەیا نەوەستا! بەڵکو بۆ بەرز بوونەوەی خۆی فڕینێکی زۆر بە تیژی کرد، تەنانەت گەیشتە شوێنی کە گرنگیی بونەکەی بۆ مەردم شانی دا لە گرنگی ئەدەب لە پایەی ئەو مەردمەدا!..ئەمەش لەبەر دوو شت بوو“ یەکەم لەبەرئەوە بوو وەکوو خوانێکی رازاوەی پڕ لە هەموو جۆر خواردەمەنی‌ی لێ هات بۆ دانیشتوانی“ چۆن ئەو خوانە بە پێی چەشەی دانیشتوان خواردەمەنیی لە سەرەو هەر کەس چی ئارەزوو بکات ئەوەی ئەخوا رۆژنامەکەش وابوو، لە هەموو جۆرە بابەتێك کەوتە سەر لاپەڕەکانی“ لە ئەدەب، لەزانیاریی، لە فەلسەفە، لە مێژو، لەپیلان، لە کاروباری رۆژانە. هەرکەس چی ئارەزەوو بکات ئەتوانێت ئەوەی لێ وەربگرێت..

هەموو

وەر



دووەم پەلاماردانی مەردم و خوێندەواران بۆی لەبەر هەرزانیی نرخەکەی، ئەو هەموو خواردەمەنییە رۆحییانەی ئەهاتە بەر دەست بە نرخێکی هەرزانی وا کە ئەگەر ئەو کەسە بیەوێت یەکێ لەو بابەتانە کە لە رۆژنامەکەدا هەیە لەکتێبێکی سەربەخۆدا بیخوێنێتەوە بەشی خۆی لێ وەربگرێ ئەبێت بێنێ بیست ئەوەندەی نرخی رۆژنامەکە بدا بەو کتێبە کە خاوەنی تەنها یەکێ لەبابەتەکانی نرخی رۆژنامەکەیە!!..

سێیەم لە سەردەمی داهاتنی رۆژنامەوە وەکو ڕەوڕەوەی هەموو شتێکی گێتی زۆر بە تەکان ئەخولێتەوەو بەرەو پێشەوە ئەڕوا ئەبێت بیرو باوەڕی تاکی ئەربابی هەر پیشەیەك شان بە شانی شتەکانی تر ئەمیش تەکان بدا ئەگینە بە تەواوی لە کاروان دوا ئەکەوێت!... وەکوو رۆژنامە ئەم هەموو شتانەی لەسەر لاپەڕەکەی خۆی لە ماوەیەکی کەمی یەك رۆژیی وەیا یەك حەفتەییدا کۆکردەوە خوێنەرەکەشی بەو جۆرە ئەبێت لە گەڵیا بکەوێتە پەلەو ئەوانە بگرێت“ وەرگرتنەکەی ئەم بەو جۆرە ئەوەیە کە لەکاتی پشوودانیا بە پەلە گۆشەیەکی چاوی بخشێنێ بە سەرتاپای رۆژنامەکەدا!. بە ماوەیەکی کەم ئاگادارییەکی زۆر لە کاروباری گەلێك شت وەربگرێت. ئەم وەرگرتنەی بەم ماوە کەمە ئەمە تیژییەك بوو لە پێشکەوتنی بیرو باوەڕیان، بۆ خێرا رۆیشتن شانی‌دا لەو تیژی‌ی خێرا رۆیشتنە کە رۆژنامەکە ئەو هەموو شتانەی لەو ماوە کەمەدا کۆ کردەوەو خستیە بەر دەستی خوێندەوارانیەوە!!...

ئەم راپەڕینە پیشەسازییە کەوا بەم جۆرە بەگوڕ سنگی ناوە بۆ پێشەوە وەکوو ئەڵقەی زنجیری سەر مەکینەیەکی خول خۆرەوە وایە بۆ هەموو شت، ئەگەر یەکێ لە ئەڵقەی زنجیری سەر مەکینەکە بوەستێ هەموو ئەڵقەو مەکینەکە ئەوەستێ!.. ئەوەندە هەیە لە بارەی پیشەسازیدا ئەگەر تاکێك شان بەشانی ئەو پێشکەوتنە نەڕوا، زۆرتر پاشکەوتن‌و وەستانەکە روو لە خۆی ئەکاتەوە تا

کەسانی تر!.. وەکوو چۆن ڕێگایەکی دووری دە ڕۆژیی کاروان، سروشتی پیشەسازیی نزیکی کردەوەو ئەو ماوەیە هاتە سەر دە سەعات و بە ئەو دە سەعاتە ئەو ماوە درێژەی بڕی!. ئەبێت لە هەموو شتێکی تریشا بەو جۆرە بە کورتکردنەوەی درێژیی بڕوا، ئەگەر نەڕوا ڕەورەوەکەی خۆی ئەوەستێ!!... ئەبێت ئەوەش بزانین کە هەر ئەڕوا، خۆی ئارەزووی لێ بێت یالێ نەبێت، ئیش لە دەسەڵاتی ئەوا نەماوە، ئەو ئیشانەی کە پێش کورت بونەوەی ڕێگاکە بە دە ڕۆژ جێ بەجێ ئەبوو، وەکوو کورتیی ڕێگاکە ئەبێت ئەویش لە پاش کورت بوونەوەی ڕێگاکە بە هاوشانی ئەو ڕێگایە بە دە سەعات جێ بەجێ ببێ، ئەگەر نەبێت ڕەورەوە کە ئەوەستێ!!.

ڕۆژنامەش یەکێکە لەو پەردە ڕواڵەتییە داهاتووانە کە شان بەشانی شتانی تر ئەڕوا، ئەوەندە هەیە شتەکانی تر کاروباری مادی-ن ئەم ڕۆحییە، ئەمیش وەکوو مادییەکە بەو جۆرە ڕێگای بۆ وەرگرتنی هەموو جۆرە خواردەمەنیەکی ڕۆحیی کورت کردەوە، بەڵێ!. ئەمە ڕوی دا بەڵام ئەتوانین ئەو پرسیارەش بکەین بڵێین: ڕۆژنامە بەرانبەر بە ئەدەب چ پلەیەکی بڕی و چ ڕێگایەکی کورت کردەوە؟!.

ئەڵێین ئەدەب پێش داهاتنی ڕۆژنامە کۆششی هەرە بەرزی زۆرتر بۆ ڕازاندنەوەی ووشەو ڕستەی سەروادارو ووتەی قەڵەو قەڵەوی وابوو کە لەچینێك بەولاوە ئەوانەیان نە ئەزانی، خەریکبون بەدانانی شتی واوە وەختێکی زۆری ئەویست!. ئەو نووسەرەی کە ئەو شتانەی دائەنا ئەبوایە بەشی هەرە زۆری مێشكو کاتەکەی لە ڕێگای ئەوەدا خەرج بکا!. ئەمەش بۆ کەسانێك کە ئەوانیش چەشنی خەریکبوونی کاتیان خەرج بکردایە بۆ لێ تێ گەیشتنی!.. بەڵام کە ڕۆژنامەو گۆڤار داهات، لەبەرئەوە کە بابەت زۆر بوو نووسەر ئیتر ئەو وەختەی جارانی بۆ نامێنێتەوە کە لەگەڵ یەك شتا خەریکی بکات، بە ناچاریی ئەبێت بکەوێتە پەلە. ئەبێت بکەوێتە سەر ئەوە کە زیاتر گوزارە لە مەردم بگەیەنێت و ئیتر نەتوانێ ووشەی بەدیمەنیشیان بۆ دانێت! ڕۆژنامە لەو ناوچەیە دەرچوو کە هی چینێك بێت بەڵکو بوو بە هی هەموو دەستەیەك. خوێندەوارێکی زۆر بەرزو نیمچە خوێندەوارێك بەیەك چاو سەیری ئەکەن، خوێندەوارە بەرزەکە لەزۆر بابەتیەوە چی لێ وەرئەگرێت نیمچە خوێندەوارەکەش چەشنی شتی لێی وەر ئەگرێت، واتە لە پلەی هەردوو لایانایە!!...

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ بڵێیت: کەواتە پلەی خوێندەواری نزم بووەوە!.. ئەوە ناگەیەنێ چونکە خوێندەوارییەکەی پێشوو لە ئەوە کە هەر چینێك بوو ماوەکەی تەنگ بوو، خوێندەواریی پاش داهاتنی ڕۆژنامە ئیتر تایبەتی نەبوو بە چینی هەرە بەرزەوە. مامۆستا دانشگاکە لەبەرکوڵی کاروباری ڕەمەکیی چی وەر ئەگرت، کرێکار کارگەکەش هەر ئەو کاروبارەی ئەوێو هەر ئەوە وەر ئەگرێت، شتی تر ئەهێڵێتەوە بۆ مامۆستاکە. هەر دوو لایان گوزارەیەکیان ئەوێ کە باسی کاروباری ڕۆژانە بکات، ئەمەش ئاسانە. هەر لە هەمانکاتا خوێندەوارە بەرزەکە لەگەڵ وەرگرتنی شتی ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکەدا ئەویش ئەتوانێ تا ئەندازەیەك ئەو شتانە کە باسی زانیاریی و ئەدەبی بەرزو شتی تر ئەکەن هەر لە سەر لاپەڕەی ئەو ڕۆژنامەیە بیخاتە بەرچاوی ئەربابی خۆی و بەرچاوی ئەو کەسانە کە شتی شایانت یان ئەوێت!!..

بە کورتی نووسەر و خوێندەوار بوون بە دوو بەشەوە لە ڕۆژنامەدا" نووسەرێکی وێنە گریی، واتە هەستی خۆی بەرانبەر بە وێنەیەك لە وێنەکانی ژیان وەیا کارو بارێك لە کاروباری کۆمەڵایەتی دەر دەبڕێت، ئەمە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو جۆرە شتانەیان ئەوێت، بەشەکەی تریشی لەو نوسەرانە نوسەرێکی بیر ڕۆشنی-تەسقیفییە-. واتە نووسەرەکە وەکو مامۆستایەکی زانیاریی و ئەدەب ئەو شتانە دەر ئەبڕێت کە ئاشنایەتییان بەو ئەدەب و زانیارییەوە هەیە، ئەمەش بۆ ئەربابی خۆی... بەڵام لە ڕاستیی دا بۆ سوود گەیاندن بە گشتیی دەستەی یەکەم لە باری ڕۆژنامەو کۆمەڵدا بە کەڵکترە چونکە بەرهەمەکەی ئەو بۆ هەموو چینەکەیە نەوەك بۆ دەستەیەکی تایبەتی!...

## ئە [illegible] تا ڕۆژنا [illegible]

وەکو بە ووردبونەوە دەر ئەکەوێت ڕۆژنامە مەیدانێکە بۆ کشانەوەو بڵاو بونەوەی لێ کۆڵینەوە، جا با ئەم مەیدانە زۆریش بەرچاو نەکەوتبێت. ئێمە مەبەستمان چۆنیەتی و واقعەکەیە، مەبەستمان هاتنە گێتی بونەکەی نییە!. تەماشا ئەکەین سەردەمێك ڕۆژنامە مەیدانی ڕستە ڕازاندنەوە بووە، پاش ئەوە ووردە ووردە لەو ڕێگایە لای داو کەوتە سەرکۆشش کردن بۆ ڕوون کردنەوەی گوزارەو تێ گەیاندنی کۆمەڵ لەکارو باری ژیان. ئەمە لەڕاستی دا بیرێکی لاڕێگە_ غەیر مباشر-ی لێکۆڵینەوە بوو کەوا لە و ڕێگاوە لا دراو ڕێگاکەی دوایی گیرا!...

ڕۆژنامە بوو بە قوتابخانەیەك کە هەموو جۆرە دەرزێکی تێدا ئەخوێنرا، یەکێ لەو دەرزانەی بیروباوەڕی ئەربابی نرخ شناسیی بوو کە بە ئاشکرا توانیان لەم سووچەوە ئاگادارییی خۆیان دەربڕن و بکەونە سەر ئەوە کە لە ڕێکیی و ناڕێکی زمان بکۆڵنەوە، بە تایبەتی بەو ناوەوە کە ئێمە مەبەستەکەمان ڕۆژنامەو لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بێ لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی((ژین))و گۆڤاری(( گەلاوێژ)) وا دیار بوو وە یا من وای تێ ئەگەم یەکەم مەیدانێك بوون بۆ ئەوە بەجۆرێکی ڕاستەو ڕاست قسە لە لێکۆڵینەوە و نرخ شناسییەوە بکەنو زانایانی ئەو مەیدانە بکەونە ڕەخنە گرتن لەهۆنراو لەعیباراتی ناڕێکی زمانی کوردی بۆ ساغ کردنەوەی. وەکو وتم دوور نییە بەرانبەر بە زمانی کوردی لە ئەدەب و هۆنراوەکەیا یەکەم هەنگاو کە هاوێژرابێت لەو((ژین))و ((گەلاوێژ))ە دا بووبێت!..

جا بۆ وێنەی لێکۆڵینەوەو ڕۆژنامە لە((گەلاوێژ))ی ژمارە((11))ی ساڵی((4))دا، ساڵی (1943) میرزا مارف لەهۆنراوی((پیرەمێرد)) ئەکۆڵێتەوە و ئەڵێت:

(خاڵە گیان!.

ئاوی ئامون چووم‌و نێرام بۆ(( بن عێن))!. ئێستا تەشتی تەلام ناوە بەسەر سەرمەوە، بڕوام نی‌یە پەروام لەکەس بێ، وە نیازم وایە هەر کەس لە هەر شتێك دا پێی خوار دانا، وە یا دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردبێ هەرای لێ بکەم و بڵێم چاو مەقووچێنە چاومان لێتە!!.. نەخوازەلا من بۆ جەنابتان کە بەخاڵۆی خۆم فێرم!. وەلام وایە خۆت ئەزانێ کە ئێمەش لەشعردا هەمەوەندی ئەوبەرین تەپاوتلێکمان کردووە!!.. ئینجا لەم ڕووەوە ئەم دوو کەلیمەیەتان عەرز ئەکەم:

خاڵە گیان!. هیچ گومان ناکەم کە کەس ببێ لە ئەدەبی ئێوە گومانی بێ، مەعنایەك ئێوە بیڕازێننەوە فەرقی زۆرە لەگەڵ ڕازاندنەوەی سەنعەتکارانی فنونی جەمیلەی ئیتالیای جاران" چونکە هینەکەی ئێوە جەمالی تەبیعەت ئەهێنێتە گوفتار، کەڕو کوێر وەك یەك دڵخۆش و مەسروور ئەکات، هینەکەی ئەوان جسمێکی بێ ڕۆحە، وە ئەگەر دڵخۆشیی بدا هەر بۆ چاو ساغە زۆر ووریاکانە!. بەلام خاڵە گیان!. شیعر زیاد لە جوانیی مەعناو شیرینیی بەیان ترازوویەکیشی هەیە ئەبێ بەو ترازووە بکێشرێ و جووت بەرامبەر بێ وە سەر نەکات، کەچی وەکوو بەراوەردم کرد لەو شیعرانەی کە لە ژمارە((10))ی ساڵی ((4))و مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ((1943))ی گەلاوێژدا فەرمووتانە بەراوەرد نەکراوە!. ئەوا ئێمە بەراوەردمان کردو خستمانە ترازووەکەوە، بۆتان دەرئەکەوێ کە نیوە شیعری ئەوەڵی شیعری سێ هەم لە ترازووەکەدا چەند سەر ئەکات؟!. وە وەکوو عەمەلیاتی حسابیی لە یەکم تەرح کرد حاسلی تەرحەکە هەمووی زیادەو هاوتای هاوڕێکانی نی‌یە!..

نیوە شیعرەکە:

*قژڕنین و پرچ بڕین بۆ ماتەمی جاران کە ئێستە قژ نەما*
*قژ ڕنین و پرچ بڕین بۆ ماتەم--- --- ئێستە قژ نەما*
-ی جاران- زیادە

و دیسان نیوە شیعری دووەمی شیعری پێنجەم ئەویش زۆر سەری کردووە!. بەلام تەسحێحی ئەویانم نەکردو هێشتمەوە بۆ خۆتان. خاڵە گیان!. هەر خوا سەهۆ ناکات لێم ببورە..).

((پیرەمێرد))یش لە ژمارە((12))ی ساڵی ((4))ی هەمان گۆڤارو ساڵ دا وەلامی ئەداتەوەو ئەڵێ:

(کاکە مارفە!.

گەلێ پێی خۆشحاڵ بووم کە سەرنجت داوەتە شیعرەکانم، ئینجا ئەو شعرانە بە جگەر گۆشەی خۆم ئەزانم کە زاناو خێرەوەمەندی وەك ئێوە لێی وورد بوونەوەو پێواوتانە، بەلام بە سەرپۆشەوە گوناهی خۆم بوو کە ناوم نابوو((پۆشیدە)).((60)) ساڵە شیعر ئەڵێم هەمووی لە بارێك و ((تای)) لاسەنگی نەبووەو داوێن، و پەراوێز، و خشتەك، و تەریب، و تەقەڵیشی لە خۆی و لە(جاو)ی خۆماڵی‌یە!!...

ئەشیا تۆکە لە شیعردا هاوشانی پیرەمێردی باشتر لێی وورد بویتایەوە، تای یەکەمی سێیەم و دووەمی پێنجەم دوو پیتی ((تەفسیری))یە، ویستوویە بە شێوەیەکی تریش مەعنایان لێك بداتەوە، وەکوو وتویە:

((داخە!. هێلانەی دلان، شێواوە، بێ بێنە(بۆن) سەبا)). پیتی ((بۆن)) تەفسیری((بێنە))و لە پێوانەدا نی‌یەو کەوانە (پەرەنتی)یشی بۆ کراوە. ئەویتریش ((پرچ بڕین)) مەعنای قژ بڕینە، تەنها((قژڕنین)) لە کێشانەدایە.

بارێ!. تۆ کە لە کێشانە گەڕاوی لە ڕۆحەکەی بۆچ نەگەڕاوی؟. چرای چرا وەکوژێنت((چرا)) هەڵنەگیرساندووە؟!..

مارف!. کە ڕەهەندەی ئاوی ئاموون بووی کاشکێ بە ئاوی ئاموون ((ئامۆژ))ی خۆت بشتایەوە نە دەگەیشتیە((بن عێن)). عارف نەبوویتایە مەعرووف ئەبووی. جارێکی تر ئەمەم بۆ نووسیت خستتە پشت گوێ، بۆیە لەپشت دەری، ئەگەر هەمەوەندی ئەو بەر بی، ئەبێ لەو بەر بێ!..)...

بۆ زیادە ئاگاداری-ش ئەمە دەقەکەیە کە پیرەمێرد لە ژێر ناوی ((شیعری پۆشیدە))دا ووتویە و میرزا مارف لە قەلادزەی پشت دەر لێکۆڵیوەتەوە:

*بای خەزان، خونچەی خزاندو دڕکی پیر هەر مایەوە*
*گێژە، هەرچێ، خۆی ئەخاتە گێژی ئەم دنیایەوە!*
*دادی ئایینمان لەدەست مەی نوشی‌و ڕەش پۆشی‌یە*
*هەش بەسەر ئەو جەژنە، وا سەرخۆشی، یا سەرخۆشی‌یە!*
*قژڕنین و پرچ بڕین بۆ ماتەمی جاران کە ئێستا قژ نەما*
*پیرێژن ما!. مووی بڕووتێنێتەوەو بیدا بە با!..*
*زوڵف کە ڕووی داپۆشیایە بانگ و هاواریان ئەکرد:*
*خەڵکە مانگ گیرا!. لە تەپڵ و دومەڵەك دەن دەست و برد!*
*ئیستە زوڵف بڕا، سفوری مانگە ڕوو پۆشی نەما*
*داخە!. هێلانەی دلان شێواوە بێ بێنە((بۆن)) سەبا*
*بێتو، شەو، تۆ بێتەلام، ڕۆژی چرام پێویست نی‌یە*
*تۆ وەرەو بم ناسە پیشەی من چراوەکوژێنی‌یە!.*
*هەر کەسە هاواری چاوی پیس ئەکاو من چاوی جوان*
*بەندی جەرگی وا بڕیوم نیمە یادی نیشتمان!.*
*ئەم گرو گالانە شێوەی شیعری کۆنە ئێستەکە*
*هەوڵی سەربەرزی گەلت بێ، زوڵف و ڕوو گوێ لێ مەکە!.*

ئەم لێکۆڵینەوە و وەڵامە بەم جۆرە کە لە هۆنراوی کوردی دا بووە لە سەر لاپەڕەی گۆڤارێکی وەکوو گەلاوێژ بە تەواوی پشتیوانیی ئەوەمان بۆ ئەکات- دیارە بەرانبەر بە زمان و ئەدەبی کوردی- کە رۆژنامە یەکێك لە مەیدانەکانی لێکۆڵینەوە بووە و ئاشنایەتی رۆژنامەو لێکۆڵینەوە ئاشنایەتیەکی بەهێزەو رۆژنامە تەریك نییە و نەبووە لە باسی لێکۆڵینەوە. و کورد تا ئەندازەیەك توانیویە لەم ڕووەوە و سنگ بنێ بۆ پێشەوە با لە ڕووی داهاتنی مێژووی رۆژنامە و نرخ شناسیشەوە ئەوەندە کۆن نەبێت!..

دیسان ئەمە وێنەیەکی پچووك بوو بۆ ئەو مەبەستە کە ئێمە گرتبوومان بە دەستەوە لەبارەی نرخ شناسیی لە رۆژنامەدا و یا پەیوەندی رۆژنامە بە لێکۆڵینەوەوە بەرانبەر بە ئەدەبی کورد و بە زمانی کوردی. مەبەستەکە ئەوەیە کە هەبووەو هەیە...

زۆر جار مەبەست لە دانان یان دەربڕینی زانیارییەکدا ئەوەیە کە گەوهەری ئەوشتە باس بکرێ‌و شتەکە بدۆزرێتەوە، و ئەگەرێ کەوت و یا هەبوو وێنە بۆ ئەو شتە بهێنرێتەوە، جا با ئەو وێنەیە لە ناو زمانێکا هەبێت و لە زمانێکی ترا نەبێت، ئەمەیان مەبەست نی‌یە.

لەشوێنێکی وا دا کە باسی رۆژنامە و نرخ شناسی ئەکرێت مەرجەکە هەر پەیوەندیی زانیاریی‌یەکەیە با وێنەی لە زمانێکا هەبێت و لە زمانێکی ترا نەبێت. خۆ ئەگەر بێینە سەر زمانی کوردی ئەوا وێنە هەبووە و بەڵکو و زۆریش هەیە. ئەوەندە هەیە بەم تاقە یەکە ئێمە وا زمان هێنا چونکە بۆ وێنە یەکێك بەسە.



سەرچاوە

نرخ شناسی، عەلائەدین سجادی 1970، چاپخانەی مەعارف بەغدا



# ڕشتەی مرواری

*کابرایەکی کورد وازی لە گەرمیان و کوێستان کردن هێنا و وتی: *بۆ خۆم جوت و گا ئەکەم، یەك دوو ساڵ کردی شتێکی وای دەست نەکەوت.* ساڵێکیان وتی: *ئیمساڵ لەگەڵ خوادا ئەبم بە شەریك.* بەو نیازەوە دەستی دایە، وەردی بڕی و بۆی چاند، گەنم دەستی هێنا بە خۆیا و زۆر باشی هێنابوو، کابرا هەموجار لەگەڵ هاوماڵەکانیا ئەچون بۆ سەیری دەغڵ و هاوماڵ پێیان ئەوت: *ماشەڵڵا دەغڵەکەت خاسی هاوردگە.* ئەویش ئەیوت: *بۆچی گەمەیە؟ من لەگەڵ خوادا بووم وە شەریك!*

گەنم هاتە وەختی دروێنە، دروێنەی کرد و خەرمان سور بوو، هاتە سەر بەش کردن. ڕووی کردە خوا و وتی: *ئەی تۆ هەقی سەپانی و وەرزێری و بنەتۆو نادەی؟ ئەبێ بیدەی!* هێنای هۆڕێکی بۆ خۆی جیا کردەوە و هۆڕێك بۆ سەپان و بنەتۆو، هۆڕکێیش لەولاوە بۆ خوا! هی خۆی و سەپان و بنەتۆوی گواستەوە بۆ ماڵەوە. هی خواش لەو دەشتە مایەوە. شەوی بە سەرا هات، وتی: *وا چاکە تا خوا نەهاتوە بەشەکەی خۆی بگوێزێتەوە بچم لێی بدزم!*

هەستا چو بە بێدەنگ گایەکی دایە پێش خۆی و چوو بۆ گەنم، لە ڕێگەدا گاکە نەئەڕۆیشت، ئەمیش چو بە ئەسپایی سەری نایە بناگوێی گاوە چپانی بە گوێچکەیەوە وتی: *دەویت باوك! من ئالیکت ئەدەمێ و کەچی لە خوا ئەترسی بۆیە ڕێ ناکەی؟ خۆ ئێستە دەسم بەسریاگە ئەگەر ڕۆژم لێ بووەوە تۆوی حەجێکت پێ ئەکەم.* بە هەر جۆر بوو گەیاندیە سەر گەنم و هەر بەو شەوە گەنمی گواستەوە، بەیانی چوە سەر شوێن خەرمانەکەو وەکو کەسێ نەیزانیبێ ڕووی کردە خواو وتی: *ها برا خێرا گەنمەکەت بەم شەوە گواستەوە، وات ئەزانی ئەگەر شەوێك بمێنێتەوە لێت ئەدزم.*

ئەو ساڵە بەسەر چوو، ساڵی دوایی دیسان ڕووی کردە خواو وتی: *با ئیمساڵیش بوینەوە وە شەریك!* هێنای وەردی بڕی و تۆوی چاندو گەنم دەستی هێنا بە خۆیا، قەفی کرد و دانی گرت و پێگەیشت و دوریەوە، کوتایی و سور بوو، خەرمان گەڵێ لە هی پار زۆرتر بوو، ئێوارە وەختێك بوو وتی با ئیمشەویش بڕوا، جا بەیانی بەشی ئەکەین.

بەشێکی شەو ڕۆیشت و نەڕۆیشت، هەورە چڵکنێکی هێناو کردی بە باران، بارانێکی زۆر قورس و لێزمە، کابرا ئۆقرەی لێ بڕا، هەر بەو شەوە چوو بۆ سەر خەرمانەکە، سەیری کرد دەنکی نەماوە هەمووی لافاو بردوویەتی! کوتوپڕ لەو وەختەدا بروسکەیەکی هاوێشت، کابرا سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان بۆ لای خوا وتی: *چرای چی هەڵئەکەی، مەگەر گووی تیا ماگە؟ گوو وە ڕیش باوك ئەو کەسە لەگەڵ توا ئەوێ وە شەریك!*

*مەلا مارفی کوکی، ناوبانگی "حاجی ئیلخانی"ی بیستبوو، تا ئەو وەختە نەیدیبوو، هەڵئەستێ ئەچێ بۆ لای داوای شتێکی لێ بکا بۆ ئەو زستانەی ماڵ و مناڵەکەی. کە ئەڕوا، بە ڕێکەوت حاجی ئێلخانی چوبوە دەرەوە بۆ ڕاو، جلی ڕاوی لە بەرا ئەبێ و بە تاقە سوارە توشی مەلا مارف ئەبێ، مەلاش بارگیرە کەرێکی هەبوو، سوار بوبوو، لێی ئەپرسێ: *ها مەلا ئۆغر بێ؟* ئەڵێ: *بە خوا ئەوی ڕاستی بێ ئیمساڵ مناڵەکانم هیچیان نیە، ئەچم بۆ لای حاجی ئێلخانی بزانم شتێکم ناداتێ بۆ ئەم زستانەمان.*

حاجی ئێلخانی، ئەزانێ کە مەلا نایناسێ ئەڵی *تەمای چەندت پێیە کە بتداتێ؟* ئەڵێ: *سەد تمەنێك ئینجا بەشم ئەکا.* ئەڵێ: *ئەگەر وتی زۆرە.* ئەڵێ: *پەنجا تمەن.* ئەڵێ *ئەگەر ئەوەشی بەلاوە زۆر بوو؟* ئەڵێ: *بیست و پێنج تمەن..* ئەڵێ: *ئەگەر هەر وتی زۆرە؟* ئەڵێ: *دە تمەن.* ئەڵێ: *ئەگەر دیسان ئەوەشی بەلاوە زۆر بوو؟* ئەڵێ: *چوارپەلی بارگیرە قۆڕەکەم ئەکەم بە کوزی دایکیاو ئەگەڕێمەوە، چی لێ ئەکەم.* حاجی ئێلخانی پێی پێئەکەنێ و ئەڵی بڕۆ خوات لەگەڵ. تا مەلا بە بارگیرە شەلەوە ئەگاتە ئاوایی و ئەچێتە دیواخان، حاجی ئێلخانی خۆی و سوارەکان ئەگەڕێتەوە لە دیواخان دائەنیشێ، مەلا ئەکا بە ژورا. مەلا چاویشی کز ئەبێ، حاجیش جلی ڕاوی داکەندبو و مەلا نەیناسیەوە.

لە پاش چاکی و چۆنی لێی ئەپرسی: *ها مەلا خێرە وا تەشریفت هێناوە؟* ئەڵێ: *وەڵڵا حاجی بەگ، ئیمساڵ زۆر پەرێشانین، خێزانێکی زۆرم بۆ نەگبەتی بە ڕیشەوە بوە، نە نان هەیە و نە بەرگ، هاتومەتە خزمەتت چارێکمان بکەی بۆ ئەم زستانە.* حاجی ئێڵخانی ئەڵێ: *مەلا چەندە بەشت ئەکا؟* ئەڵی *قوربان سەد تمەن.* ئینجا حاجی ئێڵخانی ئەڵێ: *مەلا زۆرە.* ئەڵێ: *با پەنجا تمەن بێ.* ئەڵی: *ئەوەش هەر زۆرە.* ئەڵێ: *بیست و پێنج تمەن.* ئەڵێ: *فلانی هەر زۆرە!* ئەڵێ: *بە قوربان لە دە تمەن کەمترم ناوێ.* حاجی ئێڵخانی پێئەکەنێ. مەلا ئینجا تیٚ ئەگا چە باسە، کە ئەمە حاجی ئێڵخانی خۆی بوە توشی بوە. ئەڵێ: *قوربان ئەگەر دە تمەنەکەم نەدەیتێ بارگیرەکەم لە دەرەوە بەستراوەتەوە!* حاجی ئێڵخانی بە تەواوی لەبەر پێکەنین شپرزە ئەبێ.

ئینجا بانگی پیاوەکەی ئەکا ئەڵێ: *کوڕە بچۆ سەد تمەن و پەنجا تمەن و بیست و پێنج تمەن و دە تمەن بدە بە مەلا با بارگیرەکەی لە شوێنی خۆی بێ!.*

*زۆر دەمێك بوو لە باوکم تۆرابوم و ڕوم کردبوە ماڵێ خاڵوان. بڵێن ئەو وەختە دوو جۆرە خوێندنیان پێ ئەخوێندم" یەکێ خوێندنی مەکتەب، کە لە پۆلی دوی ئیبتیدائی بووم، بە دەمیەوە خوێندنی عەرەبیشیان پێ ئەخوێندم، دەستیان پێکردبووم بە "عواملی جرجانی" –کە ئەمە بە ڕەوشتی کوردەواری لە سەرەتاوە ئەخوێنرێ.

باوکم کابرایەکی ناردبوو بە شوێنما "شامار"ی ناو بوو. پیاوێکی کورتەباڵای پیری چاوکزی خڕە بوو، ئەتوت تۆپە. ئەگەر ماوە یادی بەخێر، ئەگەر مردوە بە ڕەحمەت بێ– منیش کەواو سەڵتەم لە بەرا بوو جامەدانەیەکم بە سەرەوە بوو، وەکو فەقێ وا بووم. لەگەڵ خاڵە شامار لەو پێ بناری "شاهۆ"یە شەوێك ڕێمان کەوتە هۆبەیەکی گەورەو لەوێدا دەوارێکی هەژدە هەستونی هەڵدراوبوو چوینە ئەوێ.

بە تەواوی لە بیرم نیە، ئەو ڕەشماڵە گەورەیە یا هی "حبیب الله خان"ی باوەجانی بوو، یا هی خزمێکی ئەو بوو. بەڵام ئەوە ئەزانم میرزایەکی ڕیشسپیی باڵا بەرزی هەبوو، میرزا ڕەشیدی ناو بوو. شەوێ دیواخان جمەی ئەهات" خان خۆی و میرزا ڕەشید و گەلێ لە پیاوماقوڵی باوەجانی، بە جل و بەرگێکی بە پەرداخی کوردی و هەموو بە ستارخانی فیشەکەوە لەژێر دەوارا دانیشتبون. ئێمەشیان لەو سەرەوە دانابوو، خوێندەواریش هەر میرزا ڕەشید لەوێدا هەبوو.

خاڵە شامار یا لەبەرئەوە سەرو گوێلاکی سوفیانە هەڵکەوتبو، یا لەبەرئەوە کە مەبەستێکی هەبوو، کاتێ کە هاتین بۆ نوێژی شێوان لە ڕێگەدا پێی وتم" *کە چوینەوە، لە دیواخانەکەدا "حزب"ی قورئان بخوێنە.* وتم: *خاڵە شامار قورئان نازانم.* خاڵە شامار بوو بە فیشەکە شێتەو چوو بە عاسمانا! وتی: *جەنابت لە لایەکەوە مەتکەبلیت و لە لایەکەوە فەقێیت چۆن قورعان نازانی؟!*. وتم: *خاڵە شامار پیاوی چاك بە قورئان خوێندن ئەبێ پیاوی حافز بیخوێنێ کە هەموو قورئانی لەبەرە، من لەناو قورئانەکەشا بە ڕەشخوێنیش هەر نازانم بیخوێنم، ئێستە ئەم شەڕە چیە تۆ لە منت ئاڵاندوە.*

من زۆرم وت و خاڵە شامار کەمی بیست، لە بیرمە زللەیەکیشی لێ دام! چار ناچار وتم: *باشە.* لە سورەتە وردەڵەکان، دوان سیانێکم لەبەر بوو، وتم *لەوانە ئەخوێنم.* وتی: *لەوانە نابێ، ئەبێ لە قورئانی سەرەوە بخوێنی!* قورئانیشمان پێ نیە. بە ڕاستی فلانی بە دەست خاڵە شامارەوە کەوتمە ڕۆژێکی زۆر ڕەشەوە!

کە چوینەوە دیواخان ئەوا سەیر ئەکەم پەیتا پەیتا لە ژێرەوە دەستم تێوە ئەژەنێ، ئەڵی دەی! یا ڕەبی خوایە چە بکەم، دیواخانەکەش هەر زۆر پڕە، نە هیچ ئەزانم، نە ڕویشم هەڵدێ. وا ئەویش دنیای لێ کردوم بە چەرمی چۆلەکە! ئەو هەمو کوتەکی دەستی ئەوە بوو ئەیوت *تۆ دەنگت خۆشە، ئەبێ قورعانیش بزانی!. کوڕە بابە ئەمە شەرت نیە هەرکەس دەنگی خۆش بوو ئەبێ قورئانیش بزانێ؟* ئەیوت *نابێ ئەبێ بزانی.* جا وەرە تێی بگەیەنە! خوا ئەیزانێ لە ترسا لە شەرما ئەو دوو سێ سورەتە وردەڵەشم کە لەبەر بوو ئەویشم لە فیکر چوەوە! لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر ئەوەشم بخوێندایە خاڵە شامار ئەوەشی قبوڵ نەئەکرد و ئەیزانی! چونکە ئەویش ئەوانەی لەبەر بوو.

منیش ئێجگار ترسی میرزا ڕەشیدم لێ نیشتبوو، خوێندەوار تەنها ئەو لە دیواخانەکەدا هەبوو، ئەگینە ئەمتوانی دەوری "عوامل"ەکە بکەمەوە و لەوانی بکەم بە "قورئان!" دیار بوو خاڵە شاماریش عەواملی نەئەزانی، بەڵام میرزا ڕەشید هیچ نەبێ ئەیزانی ئەمە قورئان نیە.

کوتەك لە بەهەشتەوە هاتوە! خاڵە شامار تەنگی پێ هەڵچنیم. بە دەنگی بەرز "اعوذ بالله من الشیطان الرجیم. بسم الله الرحمن الرحیم"ێکم بۆ کرد –ئەوەندەم لەبەر بوو!– پاش ئەوە پیا هاتم و تۆزێ ڕوم کرایەوە، ئەوی خوا نەیوتبوو ئەوەم وت! بە دەنگی بەرز و بە مەقام دەستم پێکرد. ئێستە ئەزانم کە ئەو وەختە ئەمزانی "نذیرا، بشیرا، بصیرا" هەیە لە قورئانا، بەڵام من نەئەکەوتوە فیکرم! چەند شتێکم ئەوت –کە خۆیشم نەمئەزانی چی ئەڵێم– و ئاخرەکەیم ئەهێنایەوە بە شتێکی وەکو "شتیرا"!. دوو سێ شتی ترم ئەوت و ئەمبردەوە سەر "شلێرا".

ئێجگار کە سەیرم ئەکرد خەڵکەکە هەموو سەری بۆ ئەلەقێنن و پێیان خۆشە، بە تایبەتی میرزا ڕەشید، ئاگام لێ بوو ئاو بە چاویا ئەهاتە خوارەوە، ئیتر بە تەواوی منیش گەرم بوم! خاڵە شاماری لای خۆشم، لەگەڵ سەرلەقاندن و فرمێسکەکەیا، جارجار لە ناکاو هوێکیشی بۆ ئەکرد. ئیتر نازانم یادی شێخی ئەکرد، یا قورئانەکەی من کاری تێ کردبوو؟! بەڵام لە ڕاستیشا دەنگم خۆش بوو.

بەمجۆرە بە "شتیرا، شلێرا، دلێرا، سپێرا، کولێرا.. هتد" قورئانم هەمووی بە "ر"ی قپەڵە دوایی هێناو ئێستەو ئەوسا، کەس نەیزانی کە ئەمە قورئان نیە، کەسەکەش هەر میرزا ڕەشید بوو، چونکە ئەو خوێندبوی، ئەوانی تر هیچ، میرزا ڕەشیدیش لە هەمویان زیاتر چوبوە دڵیەوە، کە قورئانێکی ڕەوان‌و بە تجویدم خوێندوە!

ئەو شەوە خزمەتێکی زۆر زۆریان کردین. بەیانیش، خان، ئەسپێك و زەلامێکی پێ دایین کە من ئەو ڕۆژە تا کوێ بڕ ئەکەین بە سواری بڕۆم پاشان پیاوەکە ولاغەکە بەرێتەوە، لەو قورئان خوێندنەوە خان وا چوبوە دڵیەوە کە من بەچکە ئەسحابەیەکم و ئەو شەوە ڕێم کەوتۆتە ئەوێ!

کە تۆزێ لە ڕەشماڵەکان دور کەوتینەوە خاڵە شاماریش هات، سوار بو و منی خستە پاشگری خۆی! وتی: *بێ ئەقڵ من هەر بۆ ئەمەم بوو کە ئەموت قورئان بخوێنە، ئافەرم کوڕم ڕوی مامی خۆتت سپی کرد!*. منیش ئیتر ئەوە قورئان بوو، ئەگینە لەسەر ئەسپەکە ئەیخستمە خوارەوە!

*فایق بێکەس لە تەوێڵە موعەلیمی مەکتەب ئەبێ. کاربەدەستەکانی ئەوێ لەگەڵ هینەکانی سنوری ئێرانا هەموجار هاتوچۆی یەکیان ئەکردو ناسرەوای لە بەینیانا هەبوو. جارێك قۆمیسەرێکی تازە هاتبوە نوختەکەی ئەوبەری تەوێڵەوە –بەشی ئێران– فایەق بێکەسیش کاربەدەستە هەرە گەورەکانی تەوێڵە کۆ ئەکاتەوە" وەکو مامۆستای قوتابخانە و مەعموری استهلاکت و کاتبی بەلەدیەو بارچاوش و ئەمانە. وەڵام ئەنێرێ بۆ نوختەکەی ئێران کە ئەم کاربەدەستانە گەورانە دێن بۆ بەخێرخاتنی ئەو قومیسەرە تازەیە! ئەوانیش کاربەدەستە گەورەکانی خۆیان –وەکو پۆلیس و قایشێ لە ژور پۆلیسەوەو ئەمنیەو قۆمیسەر– هەموو کۆئەبنەوە و چاوەڕێی هاتنی ئەمانە ئەکەن.

دەستەی ئەملا کۆئەبنەوە و ئەڕۆن، فایەق ئەڵێ" *ئێوە هیچتان دەنگ مەکەن، من بەم قۆمیسەرە تازەیەتان ئەناسێنم*. کە ئەگەنە لای ئەوان، ئەوانیش هەموو بەرزەپێ ڕاست ئەبنەوە و بە جۆری عەسکەری ڕائەوەستن. فایەق خۆی لە پێشا ئەچێ و دەست ئەخاتە ناودەست قۆمیسەرەکە و پێی ئەڵێ: *خۆمت پێ ئەناسێنم "مفلس الدولەی اعوری!"*. ئەمە ئەڵێ‌و لە تەنیشتیەوە ئەویش وەکو عەسکەر ڕائەوەستێ.

پاش ئەوە "ر. أ" ئەڕواتە پێشەوە، فایەق ئەڵێ: *پێشکەشت ئەکەم ئەم زاتە، "نێرەکەر السلطنە ی مەترەقی!"* پاش ئەو یەکێکی تر ئەڕوا ئەڵێ: *ئەم زاتەش متعقل خانی کەربابی!* پاش ئەو "ش. ج" ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: *ئەمەش "مێبازالله خانی اعرجی"* ! پاش ئەو "ت. ر" ئەچێتە پێشەوە، ئەڵێت: *ئەمەش "سیف الدولەی سەرخۆشی!"* پاش ئەو "ش. ن. ص" ئەچێتە پێشەوە، ئەڵێ: *ئەو زاتەش "پێك الله خانی شاربی!"*. پاش ئەو ج.ش ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: *ئەمەش "مطیع الممالکی هەڵەوەڕی!"*. پاشان "م.ق" ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: *ئەمەش "ڕەقەل الانجمەنی بێهێزی!"*. پاش ئەو "ح.ش" ئەچێت، ئەڵێ *ئەم زاتەش "ورگ الملکی ئاوسی!"*. پاش ئەو "ع.ع" ئەچێت، ئەڵی *ئەم ئاغایەش "شەکەنێر الهومایونی خڕنوکی!"*.

بەمجۆرە هاوڕێکانی خۆی پێشکەش ئەکا. کابراش لەم ئەلقابانە سەری سوڕ ئەمێنێ و ئەمانیش لە دڵا لە کوڵی پێکەنینان و دەنگ ناکەن! پاشان لێك ئاشکرا ئەبن و ئەبێ بە بەزمی پێکەنین و هەرا.

*مەلایەك لە دێیەك، ڕۆژێ حەدیسی ئەخوێندەوە، فەرموی: *هەرکەسێ قڕانێك لە ڕێی خوادا بدا، خوای تەبارەك و تەعالا دە قڕانی ئەداتەوە*. کابرایەوك گوێی لەم وەعزە بوو وتی: *من بیست سەر بزنم هەیە وا چاکە بیفرۆشم و پارەکەی بکەم بە خێر بەڵکو پارەیەکی زۆرم دەست بکەوێ!*. هەڵسا بزنەکانی پێش خۆی دا، بردنیە شار فرۆشتنی، دای بە پانزە لیرە، چواردە لیرەی دا بە هەژار و فەقیر، لیرەیەکیشی بۆ خەرجی خۆی گل دایەوە. پێنج شەش ڕۆژ سوڕایەوە هیچی دەست نەکەوت. هات چوە مزگەوتێك لە ئەدەبخانە کە دەستی بە ئاو ئەگەیاند، خەیاڵ بردیەوە وتی: *سەیرکە ئەم مەلایە چۆن تەفرەی منی داو چی پێکردم؟ هاتم بە قسەی ئەو هەرچێکم هەبوو، لەناوم دا و ئەوا ئێستە لە قڕانێ زیاتر هیچم پێ نەماوە خستمیە سەر ساجی عەلی! شەرت بێ کە چومەوە هیچ نەکەم تا مەلا ئەکوژم، چونکە منی ماڵ وێران کرد!*.

لەم کاتەدا قڕانەکەش لە باخەڵی دەرپەڕی‌و کەوتە عابخانەکەوە! وتی *خۆ من هیچم پێ نیە بیدەم بە نان و پێی بڕۆمەوە*. جلەکانی داکەندو خۆی خستە عابخانەکەوە بەڵکە قڕانەکە دەربێنێ. ئابخانەکە قوڵ بوو نوقم بوو، سێ قوم گواو چووە دەمیەوە قوتی دا! کە دەستی گێڕا پریاسکەیەکی بەردەست کەوت، دەریهێنا سەرکەوتە سەرێ، چوە وساڵخانەکە لەشی خۆی شت و جلەکانی لەبەر کردەوەو پریاسکەی کردەوە، سەیری کرد سەد و چل لیرەی تیایە! ئیتر دەستبەجێ ملی ڕێگای گرت و هاتەوە.

ڕۆژێك کە دیسان مەلا وەعزی ئەدا فەرموی: *هەر کەسێ قڕانێك لە ڕێی خوادا بدا، خوا دە قڕانی پێ ئەدا*. کابرا هەڵیدایە وتی: *مامۆستا! تۆ کە حەدیس ئەخوێنی، بە تەواوی بیخوێنە، لێی کورت مەکەرەوە*. مەلا پرسی چلۆن؟ وتی: *ئەوەش بڵی هەتا سێ قوم گواو نەخواتەوە خوا نایداتێ!*.

*کابرایەك گێڕایەوە وتی" عێل ئەچون بۆ کوێستان. ڕۆژێك لەو دەشتی شلێرەدا تەماشام کرد ئەوا سێ چوار زەلام چاڵ هەڵئەکەنن. چوم بە لایانەوە، سەیرم کرد پیاوێکی زۆر پیر دانیشتوە نان و ماست ئەخوا و ئەوانی تریش چاڵێکی قوڵیان هەڵکەندوەو ڕاوەستاون. لێم پرسی: *برا ئەمە چیە؟* وتیان: *برا ئەم ڕیش*

_چەرمۆکە باوکمانە، ئێمە ئەچین بۆ کوێستان ئەمیش ناکەوێتە پایز، هەتا بیهێرینەوە، گۆڕستانەکەیشمان لێرەیە، ئەوە ئێستا گۆڕمان بۆ هەڵکەنـد، چـاوەڕێی ئـەوەین نـان و ماسـتەکەی بخـواو بیخەینـە گۆڕەکەوەو دایپۆشین و بچین وە دوای خێڵەکەدا!._

پیاوەکـەش وردە وردە نـان و ماسـت ئـەخوا و سـەیریان ئـەکا! منیش وتم: _خـوا بتـانگرێ پیـاو ئـەوەتا زت و زینـدوە چـی ئەخەنـە چاڵ؟_ وتیان: _برا بەشـی خـۆی عـومری کردگـە با هـەر لێـرە بیخەینـە چاڵ خاسـە! لـەولاوە بۆمـان ناگەڕێتـەوە وە دەم کـۆچ و بارەوە._ وتـی بەهـەر جـۆر بـوو پیاوەکـەم لـێ سـەندن و ئـەوانم بـەڕێکرد بـە شـوێن خێڵەکـەدا. پیـاوم هێنایـە ماڵـەوە، پـایز کـە عێـل سـەرەو خـوار بـۆوە کابرا هەستا چوە پێشوازی عێلەوە.

*جارێك مەلایەکی سەرسپی ئەچێتە خێڵێکەوە، پیاوێکی پیری زەلامـی سـەرکوماریان ئـەبێ، ئـەبێ بە میوانی ئـەو، باس و خواسـی نوێـژی لەگـەڵ ئەکاتـەوە، کـابراش هیچـی لـێ نازانـێ و نەیبیسـتوە، ئەمیش ئامۆژگاری ئەکا" ئەڵێ: _تۆ پیاوێکی پیریت دنیا ئەبڕێتـەوە و ئەبێ فێری نوێژ بیت و نوێژ بکە بۆ قیامەتت چاکە._ کابرا ئەڵێ _باشە فێرم کـە._ مـەلا پێـنج شـەش ڕۆژ فێـری رکـوع و سـەجدە و دانیشـتنی ئــەکا. کتــوپڕ کــابرا ئــەمرێ! دەرو دراوســێ دێــن بــۆ پرســە و سەرخۆشی کردن لە کوڕەکەی. لێی ئەپرسن: _برا باوکت چی بوو وا مرد؟_ ئەویش ئەڵێ:

_بـە خـوا هیچـی نـەوو و سـاق و سـەلیم بـوو._ ئـەڵێن: _ئـا خر نابێ، ئەبێ نەخۆشیەکی هـەر بووبێت._ کوڕە ئەڵێ: _برا بێـژم چی؟ شـەش حەوت ڕۆژ لەمەو پێش کاورایەکی سـەر چەرمگی گـەماڵ باوکی لـێ پەیدا بوو، هات فێری خویەکی کرد پێیان ئـەوت نوێـژ! وەك هەسـون ئەیوێسـتان وە پێـوە، وەك کـەوان ئەیچـەمانەوە، وەك تولـە بـوی پێئـــەکرد وە زەویـــەوە، وەك گـــەماڵ قنگەلفســـی پێئەدایـــەوە. ئەوەندەشی ئاو دا وە قنگەیەوە. تـا لـە قنگیـەوە ئـاودزی کـرد، ئـیتر بەرگەی نەگرت، پسیاو مرد!._

*مەحمو پاشا لـە ئەستەمبول هـەڵاتبوو، بەسـەر وڵاتـی روسـیادا هـاتبۆوە، هـەمو کوێخـاو سـەرکۆماری عەشـرەتی جـاف ئەچـن بـە پیریـەوە، کـە بـە خزمـەتی ئەگـەن، یەکـە یەکـە دەسـتی مـاچ ئەکـەن و بەخێرهاتنـەوەی ئەکـەن. لـەناو خەڵکەکـەدا کابرایـەکیان شـەش حـەو جـار دەسـتی مـاچ کـرد وتـی: _پاشـا بەخێربێتـەوە، یـا ڕەبـی بـەخێر بێتەوە، سەدجار بەخێربێتەوە!._

پیــاوێکی کــە وتــی: _خزمــە تــۆ جـارێ دوو جـار سـێ جـار بەخێرهاتنـەوەت کـرد ئـیتر بەسـە ئەمـە چـیت کـرد؟_ کـابرا وتـی: _عەشـرەت لـێم گـەڕێن، وەو سەیسـایەقە لـەو ڕۆژەوە پاشـا چوگـە بـۆ ئەستەموڵ، مـن هـەروەکو جاشـکێ دایکـی لـێ گـوم بوبـێ بـە چـەم و دۆڵ و کەژەوە لوشکە لوشك و زوڕە زوڕم بوە!._

*بەگــە ی حســێن مــەولان هــەبوو پیــاوی مســتەفا بــەگی "سلێمانکەندی" بـوو. وتـی: چـەند دانەیـە پێسـتە ڕێـویم پـێ بـوو ئـەمبرد بـۆ سـابڵاخ بیفرۆشـم، ئـەو ساڵەش ڕێـوی حیـز بـوو، پـارەی نەئەکرد، شەوێ ڕێم کەوتـە یاڵاوا، ماڵێکی گـەورەم لێـوە دەرکـەوت، چومە ئەوێ، هەرکە نزیك بومـەوە ئافرەتێکی جوانکەلـە هـات و سـەر ڕێگـەی پێگـرتم وتـی: _بـە خـوا بـاوکم جێگـەمان نیـە و پیاومـان لـە ماڵەوە نیە!_ هەرچەند وتم: _کچێ ئافرەتی چاك بە، بەم زستانەو بەم نیوەشەوە بچمە کوێ؟ هەموو ئاوایی نوستوون کێ ڕێگەم ئەکاتەوە؟_ هیچ کەڵکی نەبوو، من زۆرم وت و ئەو کەمی بیست، لێیدا ڕۆیشت و قاپیەکـەی داخسـت، منـیش لـە دەرەوە مامـەوە، سـەرما کوتـامی، ناچار تەپاڵدانێك هەبوو خۆم کوتایە ئەوێ.

شـەو بـوو بـە نیوەشـەو سـەیرم کـرد قـاپی حەوشـە کرایـەوەو ئافرەتێـك بـەبێ چـرپە هـات بـۆ تەپاڵدانەکـە –ناسـیمەوە کـە ئەمـە ئافرەتەکـەی ئێوارەیـە– هـات بـە هێواشـی بـانگی کـرد: (حەمـەدێ هاتوی؟. منیش هیچ خۆمم نەبزکان وتم: _ئا!_ گرتمۆڵکەیەکی بۆ فڕێ دام وتـی: _ئـەوە بخـۆ ئێسـتە دێمـەوە بـۆ لات._ کـە کردمـەوە تەماشـام کرد دەستەسڕێکی سپی ڕیشوداری هەڵبەستراوە پڕیەتی لە گوێز و مێوژ و بادام، تێرم لێ خوارد.

لـەو وەختـەدا ئافرەتەکـە هاتـەوەو هاتـە لامـەوە، دەسـتمان کـردە ملـی یـەك و یـەکێکمان کـرد! لـە پاشا پێی وتم: _حەمـەدێ گیـان کـە چوویتە شار چیم بۆ دێنی؟_ منیش وتم: _بە خوا خۆت ئـەزانی هیچـی تـرم پـێ نیـە، هـەر ڕێویـەو ڕێـوی ئەگـەر پـارەی کـرد هـەر شـتێکت ویست بۆت دێنم._ کوتوپڕ لێم کشایەوەو وتی: _ئـای ڕێـوی باوەحیز! ئەمـە تـۆی؟ ئـەوە چـی ئەکـەی لێـرە؟_ و هەڵسـا خێـرا ڕۆیشـت، وتـی منیش لە ترسا ئیتر نەموێرا لەوێ دانیشم، وتم ئێستە ئەچێ خەڵکم بە سەرا ئەڕژێنێ، هەستام کادانێك بوو، چومە کادانەکەوە.

زۆری پــێ نەچــوو تەماشــام کــرد ژنەکــە هاتــە کادانەکــەوە، بــە سەبرێ بانگی کرد: _حەمـەدێ هـاتوی؟_ منیش دەنگی خۆمم گـۆڕی لەسەرخۆ وتم: _ئا هاتوم!_ هاتە تەنیشتمەوە، دەستمان کردە ملی یەك و لەوێشـا یـەکێکی ترمـان کـرد! پاشـان وتـی: _حەمـەدێ گیـان کـە چویتە سابڵاخ چیم بۆ دێنـی؟_ منـیش وتم: _بـە خـوا هـەر ڕێوییـە و ڕێوی ئەگەر پارەی کرد چیت بوێ بۆت دێنم._ سـەیرم کـرد دیسـان خۆی ڕاپسکاندەوەو وتـی: _ئـای ڕێـوی کـەرانباوگاو ئـەوە گەیشتیتە ئێرەش؟!_ ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت.

فلانـی، ئـەمجا بـە تـەواوی ترسـم لـێ پەیدا بـوو هەڵسـام ئەوێشـم بەجێهێشت، پشتیرە کۆنێك هـەبو، چومە ئـەوێوە، لـەوێش زۆری پـێ نەچو دیسـان ئافرەتەکـە هاتـەوە، سـەری کـرد بـە ژورەکـەداو منـیش کۆکەیەکی بچکۆلەم کرد. وتـی: _حەمـەدێ ئـەوە لـەوێیت؟_ منـیش زۆر بە سەبر وتم: _ئا._

ئـەمجا بـە سەربەسـتی هاتـە لامـەوە و دەسـتمان کـردە ملـی یـەك، لەوێش یەکێکی ترمان کرد! لە پاشا وتی: _حەمەدێ کە چوویتە شار_

چیم بۆ دێنی؟ منیش وتم: به خوا فلانی هەر ڕێویه و ڕێوی ئەگەر پارەی کرد چیت بوێت بۆت دێنم. ژنه ئەمجاره دەستی کرد به پێکەنین و وتی: خوا بتگرێ، ڕێوی بۆ خۆت و بۆ کەتنت، گوی تۆیش به گۆڕی بابی حەمەدێ!.

ئینجا لێم پرسی: ئێسته پێم بڵی بزانم باس و خواس چیه؟ وتی: چیت پێ بڵێم؟ ئەمه لەگەڵ حەمەدێ کەرانباوگاو، گۆیا دڵمان پێکەوه بوو، ئیمشەو بڕیارمان دابو به یەك كه بێت بۆ لام، ئەوا ئەو حیزەڵه خوێڕیه نەهات و تۆیش ئەم کەتنەت گێڕا. منیش وتم قەیدی نیه، ئێمه به ئیشی خۆمان گەیشتین هەرچەند زۆریشم سەرما بوو.

بەیانی ئیتر نان و شیوێکی باشی دامێ و بەڕێی کردم، که ڕۆیشتم دنیا بو به چێشتەنگاو لەسەر کانیەك دانیشتم دەسەسڕه سپیم دەرهێنا، هەندێ گوێز و مێوژی تێدا مابوو خواردم. سەیرم کرد کابرایەك هات ئەویش دانیشت، چاوی به دەستەسڕەکه کەوت به لایەوه سەیر بوو، وتی: برا ئەو دەستەسڕەت له کوێ بوو؟ وتم: برا ناوت چیه؟ وتی: حەمەدێ. وتم کەوابێ هی تۆیه و هەموو کارەساتەکەم بۆ گێڕایەوه، کابرا له داخا وەخت بوو شەق بەرێ و دەسەڵاتیشی بەسەرما نەبوو، من لەو زەلامتر و بەهێزتر بووم، وتم: برا تورەیی پێ ناوێ، تۆیش قسه بکه. کابرا دەستی کرد به پێکەنین وتی: وەڵڵا ڕاستی ئەوەیه ئەم دەستەسڕه هی منه گوێزو مێوژ و بادامم تێ کردبو و به دیاری بردم بۆ ئەو دۆستەم، پێشم وتبوو شەوێ دێم، ئیتر بۆم ڕێنەکەوت بچم، ئەوا تۆ دەستی خۆتت وەشاند. وتم: برا گوێی مەدەرێ، سوچی خۆت بوه، بۆ لەمەودواتان. دەستەسڕەکەم دایەوەو پێکیشەوه چوین بۆ سابلاخ، تا ناو شار هاوڕێ بوین، لەوێ ئیتر لێك ون بوین.

*لاله "سەرحەد"ی ڕوغزایی ئاشنایەکی سەڕاجی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، هەمیشه له قسەکردنیشا بەربەرەکانی یەکیان ئەکرد. شەوێك میوانی لاله سەرحەد بوو، بەیانی هێشتا له خەوا بوو، لاله سەرحەد هەڵی کوتایه سەر جێگاکەی نوکه شەقێکی تێوه ژندو بانگی کرد: ئا کوڕه ڕاستەوه وه، گۆرانه هێزه نیوەڕۆیه. کابرا به دەم خەوەوه وتی: گەماڵه پیره به میوانیش ئەگەفی؟!. لالەیش وتی ئابرا تۆ دەنگ! ئیمشەو خەوێکم دێگه کەسێ وانەو فاڵەکەیم بۆ بگێڕێتەوه، با وه تۆی بێژم. سەڕاجیش وتی: تۆ بێژی ئەگەر پچڕپچڕیش بێ به دەرزی و درەوشه پێکەوه گیرو بەندی ئەکەم. ئینجا دەستی کرده خەو گێڕانەوەو وتی:

"سەی سەقا"و "بالانتەران" گوێیان پێوه وێ، گوێی دوژمن کەڕ وێو چاوی گشت وردەشاتری و گەلایی کوێر وێ! له خەوما گوێلکه مێچکەیەکمان گوم بوبوو شوێنم هەڵکردبوو، گەیمه ئەو دەشتی (نێرگسەجاڕە)، ڕوانیم پیاگێکی ڕیش چەرموگی نورانی لەسەر بەردەکەی "مەحمود گاوانی" لێ هەلاژیاگه، گالۆکێکی وه تەنیشت خۆیا ڕاکێشاگەو بوزگێکی لاوخاسی له بەردەما وێساگه، چست و چالاك مەگەر هەر خۆم له تافی کوڕێنیما وا وریا بوێتم!.. پرسیم برا تۆ کێیو ئەو پیره کێس؟ وتی: لاله ئەوه بینایی چاوانەو منیش "حەمەد ڕەسوڵ الله" . له دڵی خۆما وتم پیاو، وه خوا خاس بو، ئێستا وه کەرامەت سۆراخی گوێلکەکەم بۆ ئەکا.

چومه بەرەوه سلاوێکم کرد، هیچ نەجمیا، بەڵام وه لالوتێکەوه بۆڵەیەکی لێوه هات وەکو جواوی سلاوەکەی دابمەوه واوو. تەمام بوو توڕه ببمو بێژم کاورا سلاو سلاوی خوایه تۆ بۆچ خاس جواوم نایەیتەوه، وه گالۆکەکەت ئەنازی؟!. حەمەد ڕەسوڵ الله خێرا تێگەیشت هاته بەرەوه وتی: قوروان ئەوه لاله سەرحەده، لاله سەرحەد! ئینجا جمیاو چوار مەشقی لێ دانیشت و وتی: لاله وەخێر هاتی، مەڕوانه قسور، شەو نەخەوتوم، نیازمان بوو بێینه میوانی تۆ، جارێ ئەم دەشتەم لا خۆش وو، وا تۆزێ لێره حەساینەوه. منیش وتم: قوروان وەخێر بێی فەڕو بەرەکەتت هاورد.

لەو وەختەدا لام کردەوه پێکوڕەیەك له چەمەوه ئەهات، بانگم کرد، ئا کاورا بێ لاوەلا ـ کاورا وه هەڵەداوان ڕای کرد هات. وتم بتبینم چۆن ڕائەکەی؟ بچۆره ماڵ ێمه بێژه وه "خازه" میوانمان تێت، شەکه گێژەکه سەر وڕن. گۆشتی شەکی گێژ فره خۆشه.

پێگوڕه ڕۆی و منیش ڕوانیمه بەرو بەرپشتێنی بینایی چاوان کیسەو سەویلم نەدی، سەویلەکەی خۆمم دەراورد فره خۆشەویسته لەلام، لەو ساڵەوه خازەم هاورد وو چوبومه تانجەرۆ سلێ بکەم، ئەو سەویلەم دۆزیبۆوه، کیسه توتنیش هەر ئەو کیسه بو که له کراسی منالی "قەیتولی" و خۆیشکەکەی مابۆوه هەرچەند ئەوانیش پیا هەڵئەمیزان بەڵام خازه گجارێ ئەیشۆرد، توتنەکەشی گوڕگەل له کاروانی بەغدایان داوو هەندێ توتنیان بۆ هاوردم، توتنەکه فره خۆش و مەگەر توتنی بەراوی (قاینەجه) هاوشانی بکردایه.

سەویلێ خاسم تێکرد دامه دەس حەمەد ڕەسول لله بۆم بگرێ، تا ئاگری بۆ ئەکەمەوه. هەسێ و بەردەکەم دەراورد، گازێ پوشوی ناو دارم داگیرساند سەویلم لەدەست سەندەوه و پوشوم خسته سەر، قومێکم لێدا تا خاس داگیرسیا، دامه دەم بینایی چاوان، مژێکی لێدا فەرموی: لاله ئەم توتنەت له کوێ بو، فره خۆشه بێژه جاخێکم بۆ دابگرن لەتەك خۆما ئەیوەم. وتم وه چاوان.

لەو دەمەدا تەماشامان کرد وا له دورەوه بڕه سوارێك دەرکەوتن. که هاتن من ناسیمن، بینایی چاوان پرسی لاله ئەمانه کێن؟ وتم یا بینایی چاوان کوڕگەلی تەرخانین هاتگن بۆ پێشواز. وتی با بچن وەولاوه فره بێفەڕن! به شوێن ئەوانا دەستەیەکی تر هاتن. پرسی ئەمانه کێن؟ وتم ئەمانه ورده شاترین. دیسان وتی ئەمانەش بێفەڕن. کاروانێکی تر هاتن پرسی ئەمانه کێن وتم گەلالین. وتی ئەمانه هەر فره بێفەڕن با چارەیان نەوینم!.

ئەوا بینایی چاوان خۆی لەو سەرەوه دانیشتگه. حەمه ڕەسول الله لەولایەوه منیش لەملایەوه. هەروا قسەمان ئەکرد کەچی تاقمه سوارێکی فەقیانەشۆڕی سەرو پێچ داری گشت جوان خاس جوان خاس تۆز ئەکەن و هاتن، بۆرکەوه سوارێك له پێشیانەوه تەراتێن ئەکا، بای غەزەو وه تۆزی قولیا ناگات! بینایی چاوان فەرموی: لاله

*ئەمانــە کــێن؟* وتم *ئەمانــە کوڕگــەلی ڕوغــزاین، ئــەو ســوارەش لــە پێشیانەوە "قەیتول"ی خزمەتکارتە.*

تومەز ئەمانە هەمو کە کاورای پیٚ کوڕە خەوەری بردبو، گشت هاتووون وە پێشواز. بینایی چاوان فەرموی: *ماشاڵڵا، ماشاڵڵا لە خێڵی ڕوغزایی، لە قەیتولی سورکەوە سوار!. ئا پیٚ بێژە چکی نۆما سورکەوە با خێوی* منیش وتم: *قیتە! ئا وتوینم خۆم ئاسایی وەجاخی باوکت ڕون کەرەوە* قەیتول: ئاوزەنگی پیا هاورد، خێرو بێر ویٚ، نۆما هات وە خۆیا، سەری سواریٚ بوو، کلکی سوارێك، قەیتولیش لە ناوەڕاستیا وەك حەمە رەسول الله سواری بوراق بوبیٚ وا وو!.

لەو سەردەمەدا سەیری قەیتولم ئەکرد حەمەد رەسول الله سەری نابوە بناگوێی بینایی چاوان، تێگەیشتم کە گەرەکیە وە بینایی چاوان بێژی داوای نۆماکەی لە قەیتول بۆ بکا. وتم کاکە *قسەی خۆت مەدۆڕێنە، قەیتول نەگریس و تورەو کەللەشەقە، لێت تورە ئەویٚ، میوان نەوی خوایش ویٚ نایدا.* بینایی چاوان فەرموی: *محەمەد ئەم نومایە هەر بۆ قەیتول خاسە و هەر لەو دێت، من ئێژم وە ڕەییسی عەنزە چارەوێیکی عەروەی فرەخاس بۆ تۆ بنێریٚ.*

سا ئێمە لەم حەیسەو بەیسەدا بوین تێفکریم وەك قەتارەی قوڵەنگ سەر یەك نیشتویٚ هەر پێکورەیەك سینیەك، یا سەلەیەك وە سەر سەرەوە نان هات، بەڵام چە نانێك؟. پڵاو گشت وەك مەلای سەرچەرمگ تەشوی ترشی حەسەن وەگی لە تەکا وە قاورمەی شەکە گێژا دەورا دەور دەریاگە، پیاگ ئەشیا بێژیٚ نان بۆ خوا دروس کریاگە!

نان دانرا، "خولە"ی ئەلی کەوکوژ وە خۆیو زوڕنایەوە پەیدابو، بیٚ ئەوەی کەس پیٚ بێژیٚ پێکی زوڕنایٚ لیٚ خۆش کرد و فیقاندی وە زوڕنادا، ئەوانەی نانیان هاوردوو کەوتنە ژەندن، کاورای دەهۆڵژەنی قلیاسانی وە فڕکانیٚ دەهۆڵی گەیاند، لە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا لە گشت لایەکەوە کەنیشك و شۆڕەژنی جاف گلێر بونەوە. بوە ڕەشبەڵەکێك بۆ حەمە پاشایش ئەو زەمانەوەنە نەکریاوە، جا براکەم بزانە چەند خۆش بو وە دەنگی دەهۆڵ و زوڕناوە ئەو نانە نۆشی گیان کریا.

حەمە ڕەسولٚ الله فەرموی *"شنینە"*. نەمزانی چی یێژی، بینایی چاوان فەرموی *دۆی گەرەکە*. مەشکە دۆ هات کاسەیان بۆ پڕکرد، کەوچکی نەگەرەك وو، هەر وا کاسەی نا وە سەرەوە ئۆخەیچی کرد، منیش وتم *نۆشی گیانت ویٚ*. هەروا لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا مکایڵیو سەدانی گلێر بونەوە بینایی چاوان پرسی *لالە ئەمانە کێن؟* عەرزم کرد *قوروان مکایەڵین لە تەك ئێمەدا ناکۆکن*. فەرموی *ڕایانکێشن بۆ جەحەنەم*. لە دەنگی زیڕەی ئەوان خەوەرم بۆوە..!.

کاتیٚ لالە سەرحەد ئەم خەوەی گێڕایەوە سەڕاج وتی *لالە تۆ یێژی ئەم گشت تەحامەیان هاورد خۆ من لە ماڵی تۆ چەشکەی برنجم نەکردگە؟ خازە هەر یێژیٚ برنج نەکوترياگە، چۆن بەو دەم و دەستە کوتریاو لیٚ نریا؟ منیش ئیمشەو خوا وە خێری بنوسیٚ خەوێکم دیگە* لالە سەرحەد وتی: *ئابرا بێژە بزانم تۆ چیت دیگە؟*.

سەڕاج وتی:

لە خەوما من زینێکم بۆ چارەوێیە فڵقکەی تۆ دوری وو، پارەت نەدابومیٚ هاتم بە گژتا تۆیش دەستت لیٚ دابومە شیر و سوباشی حەمە ساڵح بەگی قائمقامی هەڵەبجە گرتینی و بردینیە دیوان، پرسی: *ئەریٚ گەماڵە پیرەی بیٚ کەڵبە گەفیگە ئەم پیاوە زینی بۆ دریوی پارەت بۆچ نەداوەتیٚ؟*. تۆ، وتت *میرم ها لە ماڵما بەخێوی ئەکەم پارەی چی بدەمیٚ؟* ئەمری کرد هەردوکمانیان ڕاکێشا، منیان خستە چاڵی پیسایی ئەدەبخانەوە، تۆیان هاویشتە چاڵیٚ هەنگوینەوە لەشمانی تێوە چو.

لالە سەرحەد هەڵیدایە: وتی: *ئا ئاوە گوڕت ویٚ، خاس تیا گەوزای!*. سەڕاج وتی: *ئەریٚ وەڵڵا تیا قورس بوبوم*. لالە سەرحەد بە کەیفی بوو. کەوتە تی تاڵی، وتی *خۆڕایی نیە بانگێشتنم بۆ بینایی چاوان کردگە!* سەڕاج وتی: ئەوساکەش تۆ پێکەنیت، میر قینی هەڵسا ئەمری کرد: مەواشیر بدەلیان و بێژە ئەشیٚ یەکتر بلێسنەوە!. من دەستم کرد وە لێسانەوی تۆ، فرە خۆش وو، تۆیش دەستت کرد وە لیسانەوەی من، قێزت هاتەوەو وە سەریا ڕشایتەوە ئەوەیشیان بە زۆر هەر پیٚ لستیتەوە!.

لالە سەرحەد دەستی کرد بە جنێودان و بە دەمیشیەوە هێڵنجی ئەدا و وتی: *دەوێت باوکە، ئەوە خەونە تۆ دیگتە؟*. سەڕاجیش وتی: *ئەی گەماڵە پیرەی بیٚ کەڵبە! ئەی خەوەکەی تۆ خەوە دیگتە، قلیانت بۆ خوا لە کیسە توتنی میزاوی تێکردو بۆ چارەویە فڵقێك کە بە دزێتی چنگتان کەوتوە قسەی خواو دڵی پێغەمبەرت شکاند؟!.*

*پیاوێك بوو لە "حەمامیان" سۆفی سلێمان ی ناو بوو، پیاوێکی زۆر لە خواترس و بەدین و مریدی شێخی بورهان بوو، هەمو دەمیٚ لە مزگەوت خەریکی زیکر و فیکر بوو، ئێجگار کە ناوی خۆی بیستبۆوە (سۆفی سلێمان) پیاوێکی دینداره، بە تەواوی لە وزە دەرچوبوو! لە پێش نیوە شەوا ئەچوە مزگەوت و خەریکی تەسبیحات بوو!

دەستە فەقیەك لە حەمامیان هەبوون، سۆفی سلێمان لەگەڵیان تێکچوبوو، ئەم لێیان بوبوو بە کاك ئەحمەدی شێخ! هەر پێی ئەوتن: *فەقێیینە دیانەت وا نابیٚ کە ئێوە ئەیکەن*. ئەیوست ئەوانیش وەکو ئەم وابن، لەگەڵ ئەوەدا ئەوان خەریکی خوێندنی خۆیان بون، سەرەڕای ئەمە ژوری مزگەوتەکەش پاڵی دابو بە حوجرەی فەقێیەکانەوە، ئەم بە شەو کە ئەچوو زیکر و فیکری ئەکرد، بە جاریٚ موتاڵاو دەوری لەوان تێك ئەدا، ئەگەر بیانوتایە" *سۆفی سلێمان وا نابیٚ*. ئەو ئەیوت *ئێوە زەنیقن!* ڕۆژێك فەقێکان قسە ئەکەن بە یەك کە چارێکی بکەن. فەقیەکی قوماربازیان تیا ئەبیٚ،

ئەچێ بە لایەوە ئەڵێ: *سۆفی سلێمان من تا ئێستە هەرچێکم لەگەڵ کردویت ئەبێ لێم ببوری و بە خەڵەتا چوبووم" دوێنێ شەو خەوم دیوەو پاشەڕۆژێکی زۆر گەورەت هەیە، لە ئێستە بەدواوە لەسەر دەستی تۆدا تۆبە بێ، هەر بەو شەرتە لێم دڵگران نەبی و چاوت لێم بێ!*.

سۆفی سلێمان بەم قسەیە تۆزێ خۆی گڤ ئەکاتەوە و ئەڵێ: *ئاخر فەقێیینە من هەموجار پێم ئەوتن کە دنیا خاڵی نیە لە پیاوچاك، لە سۆزی ناڵەی ئەولیایان سەر بکەنەوە!*. بە دوو ڕۆژ دوای ئەوە، فەقێ ئەچێتەوە لای سۆفی سلێمان و ئەڵێ: *ڕوحم بە قوربانت بێ، لە خەوما چوبووی بۆ ئاسمان و وایان پێ وتم کە بویت بە پێغەمبەر!*. سۆفی سلێمانیش ئەڵێ: *خوا ئەیزانێ، منیش لە خۆما شتێك شك ئەبەم، چل ساڵە زیکرو فیکر ئەکەم، هەڵبەت ئەبێ بەرێکی ببێ بۆ ئەم ئۆمەتە!*. ئیتر فەقێ لەم بەینانەدا هەموو دەمێ دەستی ماچ ئەکاو دەست لەسەر سنگ ڕوبەڕوی ئەوەستێو سۆفیش جارجار بە بۆنی کەرامەت، قسەیەکی لەگەڵ ئەکا!

چەند ڕۆژێکی پێ ئەچێ، ڕۆژێکیان بەیانی زو فەقێ هەڵئەستێ و ئەچێتە خزمەتی سۆفی سلێمان ئەڵێ: *ڕۆحم بە قوربانت بێ شاهی ئەولیا! سەرەی ئەوەت هاتوە بچی بۆ ئاسمان، ئیمشەو لە خەوما بە خزمەتی شێخی بورهان گەیشتم، فەرموی سلێمان پێگەیشت و شەوی دوایی ئەچێ بۆ ئاسمان!*. سۆفی سلێمان هوێکی کردو وتی: *منیش وام بۆ دەرکەوتوە ئیمشەو جبرائیل دێت بە شوێنما!*. فەقێش وتی: *من لە کتێبا دیومە ئەفەرموێ. لەم ئۆمەتە یەکێك لە بیست و حەوتی شەوی مانگێکا لە پاش نیوەشەو کە دنیا کش و مات بێ جبرائیل (علیە السلام) ئەیبا بۆ ئاسمان و ئەبێ بە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ئەوا ئێستە بۆم دەرکەوت کە ئەو کەسە زاتی موبارەکی جەنابتە*.

سۆفی ئمێکی بۆ کردو هەستا چوەوە ژێر، ڕیشەکەی تاشی و کەوایەکی سەوزی هەبوو، لەبەری کردو هاتەوە دانیشت بەو نیازە کە ئیمشەو ئەچێ بۆ ئاسمان! ئیتر لای کەسیش دەنگی نەکرد، هەر تۆزە نە تۆزێك ئەچو دەستنوێژەکەی تازە ئەکردەوەو تەزبیحەکەشی ئەخستە ملی!

فەقێش لەولاوە کارەساتی ئەم بەینەی هەموو سەعاتێ گەیاندوە بە فەقیەکانی ترو ئینجا هاتن لە پێش هەموو شتێکا شتومەك و ئەسبابی خۆیان پێچایەوەو هەریکە بوخچەی خۆی حازر کردو داینا، ئینجا دو گوریسیان پەیدا کردو پێکیانەوە بەست، دنیاش زستانە تف هەڵخەی بە ئاسمانا ئەیبەستێت. کەوتە شەوێ و بەشێك لە شەو ڕۆیشت، هەموو خەڵکی ئاوایی نوستن، لێیان دا چونە سەربانی ژوری مزگەوتەکە لە کونە بەڕۆژەکەوە بەبێ دەنگ گوریسەکەیان ڕاهێشتە خوارەوە، سۆفی سلێمانیش لە خوارەوە ئەوە دانیشتوەو زیکر و فیکر ئەکاو هەر چاوەڕێی ئەوەیە جبرائیل بێت بە شوێنیا، ژوری مزگەوتەکەش زۆر ساردە، بەڵام گەرمی بە خزمەت گەیشتنی بینایی چاوان، سۆفی سلێمانی گەرم کردۆتەوە!

سۆفی ئەوەندەی زانی وا شتێك لە عاستی ئەو هاتە خوارەوە- ئەویش هەر بە عەنقەست لە عاستی کونە بەڕۆژەکەدا دانیشتبوو- نا، شتەکە وردە وردە وەکو مار کشا و هاتە سەر سەریەوە، ئەمیش دەستێکی بۆ برد سەیری کرد گوریسە. هویەکی کردو لە خۆشیا وەخت بوو پەڕ دەرکا. دەنگێکی ناسك لە سەربانەکەوە هات وتی: *یا پێغەمبەر گوریسی موحیبەت لە خۆتەوە بەستە!*. سۆفیش گوریسی لەناو قەدی توند شەتەك داو وتی: *ئیش بکە!*.

ئینجا وردەوردە هەڵیان کێشا هەتا نزیك بە بنمیچەکەیان کردەوەو سەری دای لە بنمیچەکە، وتی: *جوبرەئیل لەسەر خۆ!*. ئەوان تۆزێکی تر گوریسیان ڕاکێشاو سۆفی توند بوو لە بنمیچ، وتی: *جوبرەئیل ئەڵێم لەسەر خۆت!* خێرا گوریسیان ڕاکێشاو سۆفی سلێمان بە تەواوی لە بنمیچ توند بوو! تۆزێ عەزیەتی پێگەیشت! وتی: *جوبرەئیل، قسە بە گوێتا بچێ، ئەڵێم لەسەرخۆت!* هەموو پەراسوەکانی وەخت بوو بەسەر یەکا ورد ببێ وتی: *جوبرەیلی کرانباوگاو هەمو پەراسووم شکا، لەسەر خۆت*.

ئینجا گوریسیان وەکو داری تەون لە سەربان بەستەوەو هاتنە خوارەوە، هەرکەس نەوی لە بوخچەی خۆی و حەمامیانیان هەر بەو شەوەو بەو تۆفە بەجێهێشت. سۆفی سلێمان یش لەملاوە هەر دەست ئەکا بە جنێودان بە جوبرائیل و هەر پێی ئەڵێ *لەسەر خۆت هەتا زمانی ئەشکێ!*

ئیتر ڕۆژ ئەبێتەوە، خەڵکی وردەوردە دێن بۆ نوێژی بەیانی، تەماشا ئەکەن لەم ژوری مزگەوتە، نوزەیەك دێت و بەڵام ڕەنگی نیە، لە ئاخرا سەر بەرز ئەکەنەوە ئەوا یەکێك لە بنمیچەکە توند بوەوە و ئەم نوزەیە لەوەوەیە، ئەچن ئەیکەنەوەو ئەیهێننەوە خوارەوە، سەیر ئەکەن ئەمە سۆفی سلێمانەو بەحاڵ گیانی تیا ماوەو زمانی نیە قسە بکا، هەم لە سەرمانا، هەم لەبەر لەشی!، ئەیدەنە بەر ئاگرەکەو گەرمی ئەبێتەوە، ئەکەوێتە قسەو کارەساتەکە ئەگێڕێتەوە. خەڵکەکە سەیرئەکەن فەقیەکانیش دیار نین، کە ئەچن بە شوێنیانا تەماشا ئەکەن ڕۆیشتون، ئینجا ئەزانن ئەمە کەتنی ئەوان بوە! ئیتر سۆفی سلێمان بە نیوەنمەك و بە داوو دەرمان بە یەك دوو مانگ ئەو وەختە چاك بۆوە و ئاقڵ بوبوو، بۆ دەستە فەقیەکی تر!

سەرچاوە:

ڕشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، دووەم.

نمونەیەك لە چیرۆك

# لەپێناوی ئافرەتا!

—هێشــتا ئـەم تـۆپ و تفـەنگ وهەیتوهوتـە دانـەهاتبوو، باو،هەرباوی شیروتیرو رم ومەتاڵ بو. ئەم "تەکش" ە ی کەوا ئێسـتە ئـەیبینی ئیفتـادەو شـەلوکوێربووە لـە وەختـی خۆیـا لەهـــەمو تــۆپی((گــەڵواخی))دا واناوبــانگی دەرکردبــوو کــە بیانوتایەوا تەکش هات منالڵ لە بێشکەدا ژیرئەبوەوە!

—تـافی هەرزەکاریمـە، تـازە خـەتم داوە، ئێجگـار کـە نـاوی خـۆمم بیسـتۆتەوە، کـەس لەژوورخۆمـەوە نـابینم، سـەر لـە بەیانیـەك هەسـتام خـۆمم ڕازانـدەوە، زرێ وتاسـکلاّوم لەسـەر کرد، شیرو تیرم لە خۆم دا، مەتاڵم خستە گازی پشت و ڕم بەدەستەوە، ماینێکی ڕەشبۆرەم هەبوو پەلی لە ئاسمان ئەکوتا سوار بوم و روەو دەشت بەشوێن

نێچیرێکا توشی ئەم کارە ساتە بووم:

هەروا بەسەرشاخەکانی((کەوڵە))دا ئەگەڕام، لە دوورەوە لە دۆڵەکەی تەنیشتی ((خرۆسە))وە تارماییێکم بەرچاوکەوت بۆی شـــۆڕبومەوە، کـــە لێـــی نزیـــك بومـــەوە واپیاوێکـــە لـــە تەمـــــەنی(25)ســــــاڵی دا، هـــــەتا دەســــــت هـــــەڵبڕی کەڵەگەت،بەسەروسیما.شیرێکی بەلاقەدەوەو هەموجۆرە چەکی کەشی پێ یە، ماینێکی کویتی لە ژێرایە

هێشتا هەر لـێ دووربوم سەیرم کرد لە ماینەکەی دابەزێ لغاوەکەی کرد بە مەچەکیاوبەنە خوێنەکەی کردەوەو دانیشت بۆ میز کردن.

گەیشتمە سەری— ئەو وەختە دنیا وەکو ئێستا بە فڕو فێڵ و قومار بازی نەتەنرابوەوە، برای بۆ هەڵکەوێ لە پەنا بەردا بیکوژێ! دوژمنی خوێنە خوێشت بوایە ئەبوایە پێت بوتایە کە نیازم خراپە لەگەڵت خۆت ئامادەکە.

سـەیرم کـرد کـابرا هـەر هەڵنەسـتا ناچـار بـانگم کـرد: کـوڕە کابرا خۆت کۆکەرەوە، سواربە لەم چۆڵەدا یا ئەبم بە خەنیمت یا ئەبیت بە خەنیمم. کابرا هـەر لەسـەر پێشاوەکە ووتـی: ئێوە گـەڵواخین و بێئامـان. سـوێنم بـۆ بخـۆ تـا سـوارنەبم دەسـت نەکەیتـەوە قسـەکەی کـاری تێکـردم چـونکە تانـە بـوو، بـەڵام هیچیشـم پـێ ناکرێـت هـات بـە دەممـا سـوێنم بـۆ خـوارد تـا ســـــوارنەبێتەوە دەســـــتی لێنەکەمـــــەوە، ئینجـــــا هەڵســـــاو بەنەخوێنەکەی بەستەوەو ملی ڕێی گرت ولاّخەکەی بەشوێن خۆیـا ڕاکێشـا! ئەمـەم بـەلاوە زۆر سـەیر بـوو بـانگم کـرد کـوڕە کـابرا سـواربە ئـەوە تـۆ چـی ئەکـەی؟! هەڵیدایـە ووتـی تـۆ سـوێندت خـواردەوە تـا مـن سـوارنەبم دەسـت نەکەیتـەوە، ئێستەش من سوار نابم بۆ چ ناتناسم تۆ تەکشیت؟! کە ئەمەی ووت هـەر زۆرم بـەلاوە سـەیر بـوو! تـێم خـوڕی کـوڕە کـابرا ڕۆژ درەنگە ئەمڕۆ هەموو شتێکت لەدەست دەرکردم، یا ئـەمکوژی یا ئەتکوژم. ئێستەو ئەوسا سوار نەبۆوەو نەبۆوە، ووتـی خـۆم نادەم بەکوشتن چی ئەکەی بیکە. نزیکەی دووسەعات شوێنی کـەوتم هـیچ کـەڵکی نـەبوو!؟ ناچـار بەشـوێنەکەی خۆمـا گەڕامەوەو ئەویش بەو جۆرە خۆی دەربازکرد.

***

بۆ ڕۆژی دوایی خۆمم گورج کردەوەو سوار بوومـەوە ڕاست بـۆ شـوێنەکەی دوێنـێ— چونکە جێراوێکی چاك بـوو— هێشتا نەکەوتبوومـە سـەر شاخەکە سەیرم کرد لـە دوورەوە سوارێك

هات چۆن هاتنێك هەروەكو با ئەڕوا لە قەدو بالآیا ووتم ببێ و نەبێ ئەمە ئەوی دوێنێیە ئەمڕۆ ئەگەر پەلی بەپەلی هەورەوە بێ نایەڵم ڕزگاری بێ.

ووتم تا چاوی پێم نەکەوتووە بەڵکو بیگەمێ نەوەکو کەتنەکەی دوێنێم پێبکات. لەکلکەی شاخەکەوە بۆی شۆڕبوومەوە زۆری نەمابوو بیگەمێ سەیرم کرد دیسان لەوڵاخەکەی دابەزی و وەکو دوێنێ دەستی کردەوە بەمیزکردن!. ووتم یاڕەبی ئەم بەڵایە چییە و چۆن دەفحی کەم؟! ئێ، خۆ ناشکرێت ئەو لەسەر پێشاوە من پەلاماری دەم.

دڵم ئۆقرەی نەگرت ناچار چووم لە پشتییەوە تێم خوڕی: کوڕە هەستە ناپیاو مەیکەرە دەردەکەی دوێنێوە، هەستە یان ئەمکوژی یان ئەتکوژم!

سەیرم کرد لایەکی لێکردمەوەو هیچ دەنگی نەکرد. کە چاك لێی ورد بوومەوە کوڕە خۆ ئەمە ئەوی دوێنێ نییە! بەڵام هیچ دەنگی نەکرد، بەشێنەیی هەستا بەنەخوێنەکەی بەست و پێ لەئاوزەنگی نا پشتی تێکردم و ملی ڕێی گرت!. شوێنی کەوتم کوڕە کابرا من لەگەڵ کێمە؟. ڕووم تێکە، دیسان هەر گوێی نەدامێ و ڕۆیشت. ئیتر من والەداخا وەختە شەق بەرم. تێم خوڕیەوە کابرا! یان شت و مەك و ماینەکەت بەجێ بێڵەو بڕۆ یا ئەمکوژی یا ئەتکوژم!.

ئەمجا هەر بەدەم ڕەوتەوە



ئاوڕێکی لێدامەوەو ووتی: کابرا بەڕێی خۆتەوە بڕۆ من حەریفی تۆ نیم، پیاوەتیت ببێ و ماتڵم مەکە. قسەکەیم بەلاوە سەیر بوو چونکە وەکو لەگەڵ منداڵێکدا قسە بکا وابوو! ووتم کورە ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ یا خوێنت ئەڕژێنم یا خوێنم ئەڕێژیت، ئەوە قسە لەگەڵ کێ ئەکەی، من تەکشم تەکش با گوێت لێ بێ، کە ئەمەم ووت هەر ئەوەندەم ئاگا لێبوو ڕمەکەی لەسەر سنگم توند بوو ووتی کوشتتم یان نەء: لەمە زیاتر تاخیرم مەکە ڕمەکەی لەسەر سنگم هەڵگرتەوەو دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن کە ئەمەم دی هەروا واقم وڕما چونکە ئەمە، یەك، کەوا یەکێك بەو جۆرە بەرانبەری کردبم. وتم دەك عەمرت نەمێنێ تەکش بۆخۆت و بۆ غیرەتت! ئەوە لەکوێت، تۆ نوستویت! دیسان هەر کۆڵم نەدا شوێنی کەوتم و ئەوەندەی تر شێرگیرتربوم.

بانگم لێ کرد پیاوانەوەرە مەیدانەوە، کەوای لێهات یائەبێ بمکوژی یا ئەتکوژم. گوێم لێبوو ووتی کوڕە تۆ خوێن ئەگێڕی ماڵ کاول! من پێم نەوتی بە تاڵووکەم، بۆ بەرۆکم بەرنادەی؟ لێم گەرایەوە تا من دەستم برد بۆ شیرەکەم ئەوەندەم زانی پەلاماری دامێ وەکو چۆلەکە هەڵگرێ بەوجۆرە لەسەر ماینەکە فراندمی دامی بەعەرزا و چۆکی دایە سەر سنگم وخنجەرەکەی لەسەرملم داناو ووتی کوشتتم یان نە؟!. دەبڕۆ بەرۆکم بەردە، هەڵساو سواربوەوەو دیسان ملی ڕێی گرتەوە.

که ئەمەم دی ئیتر هیچم پێ نەما پەلاماری لغاوی مایینەکەیم داو وتم: ئەوی تۆ بە منت کرد تا ئێستە کەس پێی نەکردووم پێم بڵێ تۆ کێیت؟ وە بۆ هەر کوێش ئەچیت لەگەڵتم!؟ سەرێکی باداو ووتی تۆ شێت بوویت!. لغاوەکە بەرەڵاکە بەتاڵووکەم. ووتم ئەمەی پێ ناوێ یا کوشتن یا لەگەڵتا هاتن.

ئینجا ووتی: برام! من بۆ ناو دەریای خوێن دەچم، ئەو شوێنە شوێنی هی وەکو تۆ نییە. ووتم خۆت تاخیر مەکە لێت نابمەوە من لەتۆ زیاتر نیم. کەسەیری کرد هیچ کەڵکی نییەو لەکۆڵی نابمەوەو هەر ماتڵی ئەکەم و ووتی جڵەوەکە بەردەو سوار بەو شوێنم کەوە، ئاوزەنگی تەقین. ئینجا وورده وورده بەڕێوە دەستی کرد بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتی خۆی و وتی:

من "سەمسام"ی "سوور سووری"م، مامێکم هەیە "جیهانبەخش" لە ووڵاتی "تەرگەوڕ"، کچێکی هەیە "گوڵ ئەندام". ئەمە حەوت ساڵە دڵمان پێکەوەیە، کەس نەما نەیکەم بە تکاکارو ڕێگە نەما بۆی نەچم، هێستەو ئەوساش لای لێنەکردمەوە. داوای شیربابییەکی زۆر ئەکا منیش پێم هەڵناسێ. ئێستە وا ناچارم هیچم بۆ نەماوەتەوە ئەچم کچەکە ئەفڕێنم!.. ئەوەشت پێ بڵێم: مامەکەم عەشرەت و پشت ماڵەیەکی زۆری هەیە، بێجگە لەمانەش حەوت کوڕی هەیە منت چۆن دی هەریەکە لەوان چواری وەکو من ئەخاتە کۆشییەوە! مامەکەشم خۆی ناوبانگی ئازایی و دەست و بردی لە هەموو ولاتا دەرکردووە. ئەوەش ئەزانم کە دەستم لێ هەڵناگرێ بەڵام ناچاریشم هەر ئەبێ بۆی بچم. ئەمە سەرگوزەشتی منە. ئێستەش دیسان تکات لێ ئەکەمەوە کە بگەڕێتەوە بەشوێنەکەی خۆتا، جوانیت با لە خۆڕایی سەرت تیا نەچێت. کەگوێم لە قسەکانی بوولەم دڵ ودەروون وهێزوو تاقەتە، هەروا سەرسامیەك گرتمی! ووتم برا سەرێکەو لەڕێ تۆدا دامناوە پێ پێوەنێ. من تازە خولامی حەڵقە بە گوێ تۆم تاسەرم لە ڕێتا بەخت ئەکەم نا گەڕێمەوە. ووتی کەوایە یا اللە بەڵام چێت پێ ئەڵێم وا بکە.

***

دوانزە شەوو دوانزە ڕۆژ بەچوارناڵە تێمان تەقان، لەئێوارەی دوانزە ڕۆژەدا گەیشتینە شوێنێك ووتی لێرە دابەزین. دابەزین و مایینەکانمان بەرەڵای ناو ئەو مێرگانەکردو هاتە تەنیشتمەوە ووتی:

هۆ، ڕەشماڵانە کەلەدوورەوە دیارن ئەوە ماڵی مامەکەمە. هەقیقەت کەسەیرم کردهەتا چاو کارئەکا لەو دەشتەدا ڕەشماڵ بەبێ هەق وحساب هەڵیداوە. ووتی من لەگەڵ بانگی شێوانا لێرەوە ئەچم، لەگەڵ کچەکەدا ئەم بەیانیە ژوانێکمان هەیە ئەویش دێتە ئەوێ ئەیهێنم و لەگەڵ سفیدەی بەیانا ئەگەڕێمەوە. ئەگەر لەو وەختەدانەهاتمەوە ئەوەبزانە شتێکم بەسەر هاتوە، ئیتر هیچ لێمەوەستە سواری ووڵاخی خۆت بەو هێنەکەی منیش بەرەو بڕۆرەوە، نەکەی ئەوە بێت بەدڵتا بڵێت لەگەڵ ئەمانە شەر یا شتێك ئەکەم. لەگەڵ ئەم هەمو زۆر و باهوەدا کەبەم کوڕەوە دیبوم سەیرم ئەکرد زۆریش ئەترسا، وا دەرئەکەوت مام و ئامۆزاکانی گەلێ لەم بە دەسەڵاتتربون. خۆمن بە تەواوی ئیتر ورەم بەردابو.ئەو تەکشە کە جاران لە تاوی ناڵدار ناڵی ئەخست وباڵدار باڵ، ئێستە بێزی لە خۆی ئەهاتەوە!

ئنجا هەستا شیرەکەی کرد بە قەدیا، قەڵغانەکەی کرد بە شانی ورمەکەی گرت بە دستەوە ماڵاوایی لێکردم و بە پێیان بە ڕێکەوت. منیش ووڵاخەکانم هێنا زینەکەم لێ گرتنەوە ورەنەك وقاشاوم دان. جۆمان پێبو لەگەڵ دووباقە گیادا بۆم هێنان و دامنێ، پاش ئەمانە ئاومدان و زینەکەم لێکردنەوەو بە دیاریانەوە کروسکەم کرد.

دووبەشی شەو ڕۆیشتبو نەرۆیشتبوو ئەوەندەم زانی لە دوورەوە دوو تارمایی پەیدابووەکو با ئەیانکوتا، زۆری پێ نەچو گەیشتنەجێ سەیرم کرد سەمسامە وئافرەتێکی لەگەڵە. شەوبو هەر ئەوەندەم بۆ دەرکەوت ئافرەتێکی کەڵەگەت وبەخۆوە بووە.ئیتر دانەنیشتین پێووتم سواربە، خۆیشی سواری ووڵاخەکەی خۆی بوو ئافرەتەکەی خستە پاشکۆی و ڕووی تێکردم و ووتی:وا ئەڕۆین، من تائێستە لام بۆ دوژمن نەکردۆتەوە بە ترسەوە، تۆ جارجار ئاوڕ بدەرەوە ئەگەردیت لەشکری هەموو دنیا کۆبوونەتەوە و بەشوێنماندا دێن هیچ گوێ مەدەرێ و ووڵاخی خۆت لێخوڕەو هیچ نین هەر پێشم مەڵێ، بەڵام ئەگەر دیت هەشت سوار ئەهاتن پێم بڵێ ئەوە ئیتر ڕزگار بوون نییە!!.

ئینجا قامچیمان لە پیرە ووڵاخ ڕاکێشاو کەوتینە ڕۆیشتن بەڵام چۆن ڕۆیشتنێك با بەتۆزی قولمانا نەئەگەیشت، وا جارجاریش هەر لائەکەمەوە، بەو جۆرە ڕۆیشتین هەتا بەیان گزنگی داو دنیا بەتەواوی ڕووناك بوەوە ئەو وەختە کە سەیری ئافرەتەکەم کرد تەماشام کرد وا کچێکە لە تەمەنی هەژدە ساڵاندا، نەبخۆی نە بکەی تەماشای سای گەردنی کەی، باڵابەرزی کەڵەگەتی پێوە بوو، سوورو سپی، ئەو چاوانەی ئەتوت پیاڵەیە، گۆناکانی سوور سوور خڕوپڕ ئەتوت سێوی سەردەشتە، ئەو باسك و مەچەکە ئەتووت بلورە. قژەکانی“

قژەکانی وەك سرکەیی ئاوریشمی ڕەش بەسەر شانیا پەخش بوبوەو ئەڕژایە کەمەری. کەمەری چی ئەتوت ناوقەدی ئاسکە!. بەڕاستی گوڵ ئەندام گوڵ ئەندام بوو.

گوڵ ئەندام ئەوەی ئەهێنا کە ئەو سەمسامە جوانەمەرگە سەری خۆی لەڕێدا بۆ دانێ!!.. ڕۆژ گزنگی داو پەلکە زێڕینەکەی بەسەر دنیادا بڵاوکردەوەو لەگەڵ گوڵ ئەندام و پلپلەی سەر ئەگریجەکانیا دەستیان کرد بەچاوشارکێ!. دنیا بوو بە چێشتتەنگاوێکی درەنگ، کەلام کردەوە سەیرم کرد وا لەدوورەوە هەشت سوار-یەکێکیان لەپێشەوەو حەوتیشیان بەشوێنیەوە- هەروەکو با، دێن. کە ئەمەم چاو پێکەوت بانگم کرد سەمسام وا هەشت سوار بەشوێنمانا ئەیکوتن ئەوەندەم زانی سەمسام ماینەکەی ڕاگرت و ووتی ئیتر تەواو!. پێی ووتم تۆ نەختێکی تر سوار ولاخی خۆتبەو بەو شوێنەدا کە هاتبووین بگەڕێتەوە بۆ ووڵاتی خۆت، بەڵام جار جار یادێکم بکە، کە قسەکەی کرد دڵم پڕ بوو، ئاو بەچاوما هاتە خوارەوە. لەماینەکەی دابەزی جڵەوەکەی دایە دەست گوڵ ئەندام و بەقوڵپی گریانەوە پێی ووت: بچۆ لە قەراخ ڕێگەکە بوەستە دوا جار سواری ئەم ووڵاخە بەو گەردنم ئازاکە بۆ کوێ ئەچی بچۆ وا لەبەری یەکمان نەخوارد!. هەردوکیان فرمێسك بەچاویانا هاتە خوارەوە، بەمنیشی وت تۆش لەو بەرەوە ڕاوەستە سەیری ئەم نەبەردو ڕەزمە بکە، خۆیشی ڕووبەڕووی سوارەکان لە چەقی ڕێگاکەدا وەکو سنگ چەقی و دەستی خستە سەر مستوی شیرەکەی!!.

زۆری پێ نەچوو سوارەکان گەیشتنە جێ، سەیرم کرد وا یەکیکی ڕیش سپی، ڕیشی ئەڕژێتە پشتێنەیی و حەوت گەنجی تازە پێگەیشتووی لە دواوەوەیە هەموو نیشانەی ئازایی و پاڵەوانیان لەناوچاودا دیارەو ئاگریان لێ ئەباریێ. سەمسام پێی ووتم ئەو ڕیش سپیە مامەکەمەو ئەوانیش کوڕەکانین. لەوێ ئەوانیش بەرامبەر بە سەمسام وەستان.

ڕیش سپیەکە هەڵی دایەو وتی: سەمسام ئەم کەتنەت بۆ گێڕا!

بۆچی لەناو هەموو عێلی تەرگەوڕا حەیات بردم؟ سەمسام-یش وتی: مامە حەوت ساڵە ڕجاو تکا ئەما نەیکەم گوڵ ئەندامت نەدامێ لەگەڵ ئەوە کە ئەو بۆ منەو من بۆ ئەو. منت گۆڕییەوە بە ماڵی دنیا. ئێستەش هیچ نەبووە هەر لێرە ئەوەندە بڵێ وا پێم دایت. ئیتر من هیچم ناوێ. وتی: ڕۆڵە تازە کار لەکار ترازا.

ئاوڕی دایەوە بەلای یەکێ لە کوڕەکانیەوە و ووتی: "ئابچۆ سەرەکەیم بۆ بێنە!" کوڕە وەکو کێچ ڕاپەڕی لە ماینەکەی دابەزی و هات بەرامبەر بە سەمسام وەستا دەستی دایە شیرەکەی.

سەمسام هەڵی: دایە مامە! بۆ خاتری خوا مەکە باخوێن نەکەوێتە بەینەوە، لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە. دیسان لەوێوە بانگی کردەوە: "ئا سەرەکەیم بۆ بێنە".

لەو مەیدانەدا ئەو دوونەمامە کە هێشتا هەر تامەزرۆی بایەخی ژیان بوون دەستیان کرد بە شیرو تیر لەیەك دان. کەسەیرم کرد بەڕاستی، ڕاستی کرد سەمسام، کە وەختی خۆی پێی وتم کوڕەکانی مامم هەریەکەیان چواری وەکو من ئەخەنە کۆشیانەوە. هەرچەندم ئەکرد نەمئەزانی سەیری دەست و بردی کامیان بکەم!.

بەو جۆرە لەو مەیدانەدا ئەو کوڕە نزیکەی نیو سەعات خۆی لەبەر ئەو شان و باهوە پاڵەوانەی سەمساما ڕاگرت، لە ئاخریا کە هات شیرەکەی داهێنێتەوە سەمسام شیرەکەی خۆی ئاوقای سەر شانی ڕاستی کردو لە پەراسوی چەپیەوە دەرچوو!. کوڕە لەوێ کەوت، من ئیتر خۆم ڕانەگرت فرمێسك بەچاوما هاتە خوارەوە، ئاگام لێ بوو گوڵ ئەندامیش لەوێ دایەوە پرمەی گریان.

کە جیهان بەخش ئەمەی دی لای کردەوە لە یەکێکی لە کوڕەکانی ووتی: "ئابچۆ سەرەکەیم بۆ بێنە". یەکێکی تریان پەلاماری دایەو بۆی هات. سەمسام دیسان بانگی لێکردەوە مامە بۆ خاتری خوا وازبێنە با ئیتر بڕێتەوە لە خۆڕایی خوێنی ناهەق مەڕێژە، ئەویش بانگی کرد ڕۆڵە! تا ئێستە ئێسك نەشکابوو لە بەینا، ئەوا ئێستا ئێسکیش کەوتە ناوەوە تازە تێپەڕیوە!!..

سەمسام لەگەڵ ئەویشا کەوتە شەڕ زۆری پێنەچوو ئەویشی کوشت!. مامەکەی دیسان لای کردەوە لە یەکێکی تر لەکوڕەکانی ئابچۆ سەرەکەییم بۆ بێنە!. ئەویش هات ئەویش کوژرا!. پێ ناوێ هەر حەوت کوڕەکەی نارد هەموویان بەدەستی سەمسام کوژران. ئەوەش سەیر بوو ئەم کارەساتە خوێناویە ڕووی دا هیچیان قسەیەکی تاڵیان لە دەم نەهاتە دەرەوە!. ئەم هەر ئەیوت مامە وامەکە، ئەویش هەر ئەیوت ڕۆڵی تازە تێپەڕیوە!.

ئینجا کە کەس نەما ئەوەندەم زانی جیهان بەخش ئاوزەنگی دا لە ولاخەکەی و هات لە پێش سەمساما دابەزیو

ریشـەکەی کـرد بـە بـەر پشـتێنەکەیاو ووتـی: "ڕۆڵـە تـا ئێسـتە شەڕ، شەڕی کاروان بـووە، ئێسـتە شـەڕ، شـەڕە قوچـی بەرانانـە چـاوت لـە مـامی خـۆت بـێ چـیت پـێ بکـا!" دیسـان سەمسـام هاواری لێ کرد مامە! با بەس بێ بەس.. مامەشـی ووتـی: ڕۆڵـە تازە بەسی چی بێ؟ یاری بکە یاری !.

ئـەم مـام وبرازایـە لـەو دەشـتە چـۆڵە دا بـە سـەر ئـەو حـەوت لاشــە کــوژراوە خێــر نەدیوانــەدا کەوتنــە شــیروتیر لــە یــەك وەشاندن! ڕۆڵە بڕوام پـێ بکـە ئەگـەر بڵـێم مەلائیکـەی ئاسـمان هــەموو بەچــاوی فرمێســکاوی یــەوە هاتبونــە ســەیری ئــەو کارەساتە هیچ درۆ نییەو بڕوام پێ بکە!

ئەم کوڕە گەنجە، ئەم پیرە نورانییە ئەهاتن وئەچون، گەڵ لە شــێری برســی تینــوتر بــە خــوێنی یــەك، هــیچ بــەزەییان بەیەکانەئەهاتوە! سا، چیان بە یەك کرد کردیان.

ڕۆژ، وا خەریکـە تـەنگ بـە کـەڵی ڕۆژاوا هەڵئەچـنێ، دەمـەو زەردە پـەڕە، خـوێنی شـەهیدەکانیش وا لـە ڕۆخـی ئاسمانـا خەریکــە خــۆی ئــەنوێنێ!. کوتــوپڕ جیهانبــەخش نرکــانی" سەمســـام ڕۆڵـــە بگـــرە ئـــیتر بەســـە! شـــیرێکی داهێنایـــەوە. سەمســـامیش ووتـــی: مامـــە هـــاتۆیش بگـــرە، منـــیش ئـــەڵێم ئیتربەســـە!.. تەماشـــاکە گـــەردوون ئیشـــی چـــۆن ئـــەکا؟!. لەوەختــەدا کــە شــیرەکانیان داهێنایــەوە هیچیــان دەســتیان ســەری نــەکردو خۆیشــیان بۆنــەپارێزرا. شــیرەکەی سەمســام کەوتـە عاسـتی ملاشـوی جیهانبـەخش ولـە بنهەنگڵیـەوە سـەری دەرکرد! هێنەکەی جیهانبەخشیش سەری نەکرد دای لـە ملـی سەمسام وسەرەکەی لەولاوە کەوت! گوێم لێبووکەللەکەی بەدەم خوێنەوە ووتی: ((مامە چاکت کرد)). نیوە لەشی مامەکەشی لەولاوە ووتی: (( ڕۆڵە واباشە!.))..

***

هـیچ نـەما قەڵاچـۆیان بڕایـەوە((نۆ)) تـەرم لـەخوێنی خۆیانا ئەگەوزێن. سەیرم کرد گوڵئەندام چوە پێشەوە لێان

دەسەســـرەکەی دەرهێنـــاو چـــاوەکانی ســـڕی، یەکەیەکـــە چاوێکی پیانا گێڕاو هیچ وورتەی نەکرد.

من چیم بە دڵهات؟ ووتم تازە ئەمە ڕویدا، ببێونەبێ ئەم کچە بۆ من ئـەبێ. ڕووم تێکردو ووتم: گوڵئەندام ئـەوی چاوت پێکەوت تازە قـەوماو ڕویـدا. ئێسـتە لەگـەڵ مـن وەرە بـابڕۆین. دەرکەوت کە خوا منی بەتۆ داوەو تۆ بەمن هەر کە ئەمـەم لـەدەم هاتە دەرەوە ئەوەندەم گوێ لێبو ووتی ئاگات لە خۆت بێ، تامن کەوتمە خۆم سەیر ئەکەم بە گازی پشتا دراوم بەزەویداو کچێك لەســـەر ســـنگم چـــۆکی داکوتـــاوە! ووتـــی: هـــا، چـــۆنی ؟ ووتم بەسمە. ئیتر هەستاو ووتی:

برام! من لەم شێرانەم کە لێرە کەوتون. خۆ، دیت کـە چـۆن بوون؟ وا ئەبینی باوك وحەو براو دەزگیرانێکی وەکو سەمسـام لەوێکــەوتوون. تــۆیش لات وایــە هــەنگوینت لــە ناوشــاخاو کچێکت لـەلاکۆڵانا دیوەتـەوە.با پێـت بڵـێم ئێمـە، چ ژنمـان چ پیاومان تا ئێستە کەس پشتی نەداوین بە عەرزدا.

من تائێستە خۆمم بۆ سەمسام دانابو، بەڵام باوکم بۆ پارە ئەم کەتنەی گێڕا! ئیتر لە ئێستە بەدواوە خۆمم بۆ گڵ داناوە. شیرەکەی باوکی– ئەو شیرە کە سەمسامی پێکوژرا_ هەڵیگرت تا وتم کچێ چی ئەکەی؟ لەسەر لاشەکەی سەمسـەما هێنـای بـە ملــی خۆیــاو بەســـەر لاشـــەکەدا لاربـــووەوەو بـــۆ هـــەتاهەتایی باوەشیان کرد بەیەکا!!..

ئـیترمن هـەر ئـەوەم بـۆ مایـەوە لـەناو ئـەودەریای خوێنـەدا سواری ماینەکەی خۆم بوم و بەبێ ئەوەی دەست بە هیچەوە بدەم بە شوێنەکەی خۆما گەڕامەوە.

ئێستەش هەرچەندە بیری ئەو دیمەنە ئەکەمەوە کسپە لە جەرگمەوە دێت وخووڕ خووڕ ئاو بە چاوما دێتەخوارەوە.

ڕۆڵـە ئەگـەر مامەکـەی بیـانوی ئـەو شـیربایییە زۆرەی لـەو جوانەمەرگە نەگرتایە بۆچی ئەو کارەساتە بە سامە ڕووی ئەدا؟!..

–ئەیلوولی1946

سەرچـاوە:هەمیشــە بــەهار، کۆمەڵــە چــیرۆك، عەلائــەدین سەجادی، چاپخانەی مەعاریف–بەغداد– 1960



# كوردی

1849-1809

سوتاوی سارای رەشپۆشیان بە دەست عەشقەوە، كوژراوی ئالأی بالأ نەمامان لەسەر مەشقەوە. تاقە گوڵی محمود بەگی صاحێبقران، كوردی ناوو كوردی گیان و كوردی زمان. لە كۆرری بادەفرۆشانی سۆز و گودازدا كەمەربەستە، لە پۆلی مەی نۆشانی قسەو باس و بەلاغەتدا سەر دەستە. رەنجی كە، داوە" دوایە لە پێناوی چاوی كاڵ، سەودا بووە بە خەتی سەوزی كوررێكی چواردە ساڵ.

لەم سۆزەوە بوە كە سەرەنجامی ئیشەكەی"كەوتۆتە عالەمی ئەرواحەوە و نەیماوە ئیشەكەی. لەم سۆزە وە بووە كە تەقیوەتەوە كارێزی شعری بەرزی، لافاوی كەوتە ئێران(قائانی)پشتی لەرزی. كەوابوو(كوردی) هەم شاعرێكی كوردی بوە، هەم غەرامیەكی كوردی بوە، هەم دەروێشێكی راستەقینەی كوردی بووە!..

ئەم شاعرە غەرامیە بەرزە ناوی(مستەفا) و كورری محمود بەگی كورری احمد بەگی ساحێبقران و ئامۆزای ئەورەحمان بەگی سالمە. بنەماڵە ساحێبقران بێشكە، بێشكەی شاعران بووە بۆیە ئەحمەد بەگی فتاح بەگیشیان تێدا هەڵكەوتۆتەوە. لە ساڵی (1809)ی میلادی لە شاری سولەیمانی هاتۆتە دنیاوە. هەر لە سولەیمانی خراوەتە بەر خوێندن و لە پاشا هەندێك خوێندنی علومی ئیسلامیشی لە حوجرەی فەقێیان خوێندوە. كە ئەم شاگرد بوە سالم خەلفە بووە، كە ئەم سوختە بوە سالم مستعد بووە.

هەر چەندە بنەماڵەی صاحبقران ئاوەدان بووە بە چاندنی تۆوی شعردانان بەڵام ئەوەی بە تایبەتی بو بێت بە سەرچاوەی ئیلهامی شعر لە كوردی دا"

*نەوجەوان، ئەبرۆ كەمان، شیرین دەهان و نوكتەدان*
*تورك رەفتار و پەری روخسارو كا كۆڵدارەكەم*

قادر ناو بوە لە سولەیمانی كە بە خەتی سەوزی سەرلێوی، بەكا كۆڵ و خولأمانەی سەر شانی سۆزی عەشقێكی سوتێنەری خستۆتە كوردییەوە... ئەم كوررە كارێكی زۆری كردۆتە سەر ژیانی مستەفا بەگ" تەنانەت ئەڵێن لە ئاخر هەناسەیا بە ئاگری عەشق سوتاوە و پروزەی چوە بە ئاسمانا!.

كوردی جارێك ئەبینێ كە (قالە)ی چوە بۆ(سنە)ئەمیش دەستبەجێ سولەیمانی بەجێ دێڵێ و ئەچێت بەشوێنیا، گەلێك لە سنە دا ئەسوررێتەوە، پێ ئەڵێن ئەوەی تۆ ئەتەوێ هێشتا نەهاتوە، ئیمرۆ و سبەی ئەگاتە جێ، ئەچێت بە پیریەوە و دەشتی(سەر نوێ)ی لێ ئەگرێت، كە گوێی لە دەنگی زەنگی كاروانەكە ئەبێت دەست ئەكات بە وتنی بررە شعرە بە سۆزەكەی و سەرەتای بەم شعرە ئەكاتەوە ئەڵێت:

*سەدای كاروانی فرقەت دێ، ئەڵێن سەر قافڵەچی یارە*
*زررەی پێشەنگی محنەت دێ، دەڵێن كالأیی غەمبارە!*

كوردی ئەدیبێكی پایە بەرزو شاعرێكی شعر رەوان بووە، سۆزی (قالە)وای لێ كردوە لەوانەیە كەم كەس لە غرامیاتدا دەستی ئەوێ بوبێت. كردەوەی توركەكان لە سولەیمانی دا گەلێك جار بوە بەهۆی دڵررەنجاندنی كوردی و تەواسانەوەی لە سولەیمانی و باركردنی بۆ ولأتی ئێران. لە كوردوستانی ئێراندا خزمەكانی سالم خزمی ئەمیش بوون. چونی بۆ ئێران وەكو چۆن جەوری توركان پێ كردوە هەروەها هاتوچۆ كردنی قالەش بووە بۆ سنە و لەبن دەست ئەمەشەوە دەیدەنی كردنی بووە لە خزمەكانی. لە ئێراندا زۆرتر وەختی لەگەڵ ئەربابی قەڵەم و شعردا رابواردوە، لەگەڵ دیوانی شاعرەكانی عەجەمدا سەودا سەریەكی چاكی بووە بەو بۆنەوە ناوبانگێكی بەرزی لە ئێراندا هەیە، بە تایبەتی لە سنەدا گەلێك وەختی رابواردوە و گەلێك شعری جوانی لە شوێن بەجێ ماوە. لە تاران مامۆستای شازادەكانی شای ئێران ئەبێتەوە لە یەكەم كاروانیا ئەبێت بە ئەندامی (ئەنجومەنی ئەدبیان)یش لە تاران. لەگەڵ(قائانی[1]) شاعری بەناوبانگی ئێراندا داستانێكی سەیرو شەررە شعرێكی زۆریان لە بەیندا بووە و لە ئاخردا بۆرری قائانی داوە. گۆیا ئەڵێن لەسەر رولێنانی (شا) لەسەر حەوزێك دائەنیشن و ئەكەونە مشاعرەوە، قالە لەپشت كوردیەوە وەستاوە وێنەكەی لە ناو حەوزە كەدا دیاربوە و ئەبێتە هۆی ئیلهامی كوردی، قائانی هەست بەمە ئەكات بە دار دەستەكەی حەوزەكە ئەشڵەقێنێ وێنەكە تێك ئەچێت!. كوردی هەر گوێی ناداتێ و بۆی هەڵئەستێ بە پەنجە ئەدات لە تەپڵی سەری قائانی كە كەچەڵ بوە– و ئەڵێت:

((لای ئێمە كە مانگ گیرا لەمس و تەنەكە ئەدەن!.)) قائانی بەمە زۆر تووره ئەبێت و جنێو بە(سنی)ئەدا و لەمەوە شەررەكەیان سەر

---

[1] قائانی ناوی میرزا حبیب بووە و خەڵكی خوراسان بووە، لە دەوری فەتحعەلی شا، تا دەوری ناصر الدین شای قاجار ژیاوە. بدیع الزمانی خوراسانی لە كتێبە كەیدا(منتخەبات ئەدبیات ایران) ئەڵێت قائانی لە(1270)ی قەمەری مردوە.

ئەكێشێتە لای ئەوە كە یەخەی یەك بگرن، ئەو وەختە شا تكا لە كوردی ئەكات كە وازی لێ بێنێ.

هەروەها ئەفسانەی سەیر سەیر بەرامبەر بە كوردی ئەگێڕرنەوە" وەكو ئەوە ئەڵێن پیاڵەی زەهری خواردوتەوە و پێ نەمردوە لە پاشا بە ئاگری عەشق سوتاوە. كوردی بێجگە لە كاروانە زۆرەكانی ئێرانی ئەڵێن چوەتە(شام)و دوا جاریش چوەتە پاریس و تەنانەت سەفارەتی فەرەنسەشی هەیە.

شاعرەكانی كورد بە چاوێكی بەرزەوە سەیری كوردییان كردوە" وەكو ئەوە باسی شاعرەكانی پێشوی كورد لە شیخ رەزای تاڵەبانی ئەپرسن، ئەویش ئەڵێت (ئەگەر هەمو بهاتنایەوە دنیا، رۆژێ جارێك دیدەنیم لێ دەكردن بەڵام لە كوردی رۆژێ پێنج جار)). حاجی قادری كۆیی كە باسی كوردی ئەكات ئەڵێت:

**شەهسەواری بەلاغەتی كوردان یەكە تازی فصاحەتی بابان**

**مصطفیە تخلصی كوردی غەزەلی كردە بەربەتی كوردی**

كوردی، زمان و ئەدەبیاتی فارسی چاك زانیوە، لە عەرەبی وتوركیشدا دەستی بووە. لەبەر دوور كەوتنەوەی لە كاكۆڵەكانی قالە زۆر جار ناوی شعری لە دیاری بێگانەدا كردوە بە(هجری)وەكو ئەڵێت:

**تاكەی ئاخر حەسرەتی كا كۆڵەكەت پەنهان بكەم؟**

**(هجری)ئاشوفتەدل و كا كۆڵ پەرستی كاریە!.**

دیسان ئەڵێت:

**ئومێدی وەصل دیداری نەما(هجری)ئەمێستاكە**

**هەمیشە انتظاری نامەی پەیك و سەلامێكە.**

كوردی پیاوێكی باڵابەر. و كەڵەگەت، سور و سپی، مورەش و چاو گەورەو بە هەیكەل بوە. زۆر گوێی بە جل و بەرگی جوان نەداوە بەڵام زمانی زۆر خۆش بووە. لە پاش چەند جار هاتوچۆ كردن بۆ تاران ئاخر جار كە ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی لەبەرئەوەی شەیدای عەشقێكی راستەقینە كاری تێ كردبو پێ هەڵنەئەگیرا ئەو ئەركە بەرێ بەرێوە، لەبەرئەوە بە نەخۆشیەكی نەفسی لە ساڵی(1849)ی میلادی لە تەمەنی(40) ساڵیدا گیانە پاكەكەی دا بە دەست ئەو عەشقەوە و لەشەكەشی سپارد بە دار ئەرخەوانەكانی گردی سەیوان بۆ نەمانی عەشق!. دورنیە ئیستەش لە دەرونی كورەیەكی بەجۆشەوە دەنگی سۆزی (یا قادر)لە گۆڕرەكەیەوە بێتە دەرەوە*

ئەگەر ئێمە بمانەوێ لە شعری كوردی بكۆڵینەوە لە پێش هەمو شتێكدا ئەڵێن: كوردی شاعرێكی فیتری و شعرەكانی وەكو ئاو خواردنەوە وا بون بۆی، و زۆرتر ئەفسانەی لەسەر غەرام و غەزەلیات برراندۆتەوە. ئەمانەشی هێناوە خستونیەتە ناو گوڵدانێكی وشەو بۆ ئەوە كە پیاو گوێی لێ بو هەم دڵی بە بۆنی گوڵی مەعنا بگەشێتەوە، هەم چاوی بە دیمەنی گوڵدانی وشە رون ببێتەوە...

كوردی كە لە بەهەشتی زەمانی منداڵی دەرئەچێ و ئەكەوێتە ناو دەشتی بە سامی دنیاوە، لە باتی ئەوە كە دەرو ژوری قاپی ژیان بپشكنێ بۆ ئەوە كە لەو دەشتەدا كۆشكێك دروست بكاو بە دڵنیایی تیایا دابنیشێ كە چی بە پێچەوانەی ئەمە ئەكەوێتە ناو دەریاییێكی بێ پەیەوە و بە هەر لایەكدا شان بۆ قۆڵ ئەكوتێ تەماشا ئەكات هەر لە شوێنەكەی خۆیدا!.پێ ئەڵێن: بۆچ وایە وا ئەكەی؟ ئەڵێت:

***مەكەن مەنعم كە سەرگەردان و وێڵم***

***بە دەست عەشقە زەمامی اختیارم!***

پێ ئەڵێن بازاڕی عەشق بازاڕێكی بە سامە، پیاو كە چوە ناویەوە هەر شتێكی پێ بێ ئەیدۆڕرێنی و ناویشی ئەزڕنگێ!. ئەویش ئەڵێت:

**من كە رسوا بون تەپڵی عاشقیم لێدا ئیتر**

**كوردی هیچ پەروای دڵ و ئیمان و مانی دین نیە!**

گەلێكی لەگەڵ ئەكۆڵنەوە و پێ ئەڵێن: هەمو عومری خۆتت بە خوڕرایی دۆڕراند. ئاخر تۆ ئەم عەشقەت لەسەر چیەو بۆ چیە؟!..

ئەڵێت: راستە:

**هەموو عومرم بە ضایع چو لە رێگەی عەشقدا چونكە**

**گرفتار و ئەسیری داوی عەشقی طفل فامێكم**

كە بۆیان دەرئەكەوێت ئەمە بەچكە بچكۆلەیەكی بێناوە، وا ئاگری لە عومری بەرداوە، لێ ئەپرسن" باشە! لە چە بنەماڵەیەكە؟ ئەو بنەماڵەیە لە كوێیە؟ چی لەبەر ئەكات؟ خوو رەوشتی چۆنە؟ .چۆن كوڕێكەو ناوی چیە؟.. كە ئەمەی گوێی لێ ئەبێت دڵی ئەگەشێتەوە و هۆشێكی بە بەرا دێتەوە و زمانی ئەكرێتەوە وئەڵێت:

***گەر دەپرسن مەنزل و شكل و لباس و تائفەی***

***ماڵیان نەزدیك بە بەندی خانەو ئاشی ئەحان[1]***

***ئەسمەرە، لاغرتەنە، باڵا میانە، كەچ كولاە***

---

لە مشاهیر الاكراد دا ئەڵێ: لە(1227)ی هجری هاتۆتە دنیاوە وله(1267)ی هجری مردوە. لە دیوانەكەشیا هەر چەشنی هاتنە دنیاو مردنە.دوكتر كمال فۆاد لە كتێبەكەیا (دەستنوسە كوردییەكان))چاپی ئەلەمانیا ساڵی(1970)ئەڵێت:كوردی لە(12227هـ–1812م) میلادی هاتۆتە دنیاوە، لە (1268هـ 1851م)مردوە.دوكتۆر معروف خەزنەداریش ئەو ئاگاداریەی كەدای بە من ئەڵێت (1812–1850)ئەوی لە زەوینەی كتێبەكەدایە ئەو سەردەمە دانەر بەو جۆرەی ساغ بوەتەوە.

1 بەندیخانە لەگەڵ سەرادا لە بناكانی سلیمانی ئەوڵا اغا بووە، حەوزێكی گەورە لە حەوشی بەندیخانەكەدا بووە، شوێنەكەی كەوتبووە پشت ئەم سەرای ئێستەی سولەیمانیەوە نزیك بە مزگەوتی بن تەبەق– كە لەم ئاخرەدا مزگەوتی مەلا فتح اللە یان پێ ئەوەت. ئاشەكەش كەوتبوە پشت مزگەوتەكەوە بەلای پیرمە سورەوە

*سوخمه سەبزە، مەیتەن ئاڵە، چاو خومار ئەبرۆ کەمان*
*عاقڵ و داناو موئەدەب، وەحش و مەغروورو عەجول*
*گەه دەڵێ سندان بە عاشق، گەه دەڵێ چاوم قوبان!*
*زود خێزە توند ڕەوتە، مەستە دایم چاو بە خەو*
*گاه بەد خو زاڵمە، گەه مشفقە شیرین زبان*
*سا، لە هەر کوێی کەمەستت کرد سوالی لێ بکە*
*رازی پەنهانی سەرا سەر بۆت دەکا ئەڵبەت عەیان*
*ڕەهرەوت قادر بێ بۆ اعطای جوابی مەسئەلەت*
*وەرنە (کوردی)ناتوانێ حاڵی خۆی بۆتکا بەیان!*

تەماشا ئەکەی لێرەدا شۆڕشی عەشقی کوررێکی نەورەسی چاو خوماری سوخمە ئاڵ بووە بە سەرچاوەی ئیلهامی شعری کوردی" ئەو کوردیە کە لەو دەریای بێ پەیەدا تەکان ئەداو کەچی ئەو هەمو هۆشێکی لێ سەندوە.. بەڵام ئایا ئەم عەشقە بەرامبەر بەو کوررە عەشقێکی دیمەن پەرستی بوە، یا سەودایەکی هەوەس رانی؟؟ ئایا ئەو کەسانە کە لە گۆشەی ئەشکەوتی خوا پەرست، یا لە دوکانی بازاڕی عەشق پەرستیدا بەرماڵ و کەڵپۆستیان راخستوە چی ئەڵێن بەرامبەر بەم کارەساتەی کوردی و بەرامبەر بەم شۆڕشە کە کوردی بە ئاشکرا خستویەتە ناوەوە؟؟..

بەڵێ گومانی تێدا نیە کە کاکۆڵی لە خەنە گیراوو چاوی مەستی بەدەستی کردگار جوان کراوی قادر ئاغا بوە بەو هێزە کەپێی ئەڵێن(اثیر)و گەلێ گەلێ لە هەوا ناز کترە و خۆی داوە بەسەر هەمو زەڕە- گەردێکی- مصگفی بەگدا!. ئەویش لە تاوا کە گریاوە فرمێسکی خوێنەکەی لەسەر زەوی و لەهەواوە" نەخشەی وشەی عەشقی کێشاوە وناوی قادری هێناوە!. ئەوەندە هەیە ئەگەر بێتو ئێمە نەفسی عەشق، نەفسی، عاشق، نەفسی مەعشوق بخەینە بەر ئەو مەکینەیەکە خەوشی لە ئاڵتون پێ جیا ئەکرێتەوە بۆمان دەر ئەکەوێت کە عەشقی(کوردی) بەرامبەر بە(قالە) عەشقێکی داوێن پاکی بوە، عەشقێکی خوا ناسی و فەلسەفە بوە. عەشقێك نەبوە کە کوررێك دڵی لە کوررێك چوبێت، یا ئەو عەشقە نەبوە کە کوررێك دڵی لە کچێك چوبێت، بەڵکو عەشقی راستەقینە ئەگەر بوبێت- تەنها ئەو عەشقە بوە کە کوردی بەرامبەر بە قادر ئاغا توشی بووە" چونکە ئەو کە عاشق بوە قالە بۆ ئەوە نەبووە کە لەبەر مانگە شەوێکی چواردە دا لە سای گەردنی قالەدا شەرابی سەر خۆشی بخواتەوە بۆ ئەوە بە گزیی کەوە دەستێکی بۆ قالە درێژ بکا! بێ گومان ئەگەر ئەم عەشقە نەبوایە نەیئەتوانی بڵێت:

*شەهیدی عەشقم و مەمشۆن کفنم بۆ مەکەن یاران*
*گەواهی حەشرە بۆ دەعوا شەهادەت بەرگی خوێنینم!*

بەڵکو عاشق بوە بەو دیمەنە کە عەکسی جوانی کردگار بووە لە ئاوێنەی سەرو باڵای قالەدا دەر کەتۆتەوە!. عاشق بوە بەو جەمالە کە تۆزێك بوە لە پرتەوی جەمالی بارەگای ئەو خوایە کە بەدەستێکی نهێنی گوڵی ئەندامی قالەی دروست کردوە و کردویە بە نمونەیەك بۆ دەرکەوتنی ئەو گەورەیی و دەسەڵاتە کە بەهەزاران هەزار ئایاتی کەونی غەیرە کەونی هەیە، قالە تەنها یەکێکیان و سۆزی(کوردی)ش تەنها یەکێك!..

دیسان نیشانەیەکی تر بۆ ئەوە، کە عەشقی کوردی بەرامبەر بە قالە عەشقێکی راستەقینەو داوێن پاکی بوە ئەو بەڵگە مەنتقیەیە کە، لام وایە هەمو کەس وەری ئەگرێ:

هەر شتێکی مادی یا مەعنەوی لەم گێتیەدا کە تۆ بیگری بەلانی کەمەوە پێویستە وەکو بەردی ئاگردان سێ کۆچکی ببێ: یەکەم داواکەر، دوهەم داوا کراو، سێهەم مەرام. و هەر یەك لەمانە ئەبێت لەوانە بن کە لە شانیانا ببێ ئەو ئیشەی خۆیان بەرن بەڕێوە.. تۆ دڵت لە میوەیەك ئەچێت ، ئەوا تۆو میوەکە کە هەردووکتان هەبوون، مەرامەکەش-شکاندنی ئارەزوی ئەو میوەیەیە- دیارە ئەبێت: چونکە هەم تۆ لە وانەیت کە میوە بخوێت، هەم میوە لەوانەیە کە بخورێت. کە ئەم دوە هەبو سێهەمینەکە بە ناوچاری ئەبێت. بەڵام ئەگەر دڵت لە بەردێك چو-بۆ خواردن- ئەمەرێك نا کەوێ: چونکە نە تۆ لەوانەیت بەرد بخویت، نە بەردیش لەوانەیە بخورێت بۆ نەهێشتنی ئارەزوی برسێتی. وتمان ئەوا هەر هات و کردتە زۆرە ملێ بەردەکەت خوارد ممکن نابێت جارێکی تر بتوانێ ئارەزوی بەرد خواردن بکەیتەوە.

دڵ لێ چونەکەی مستەفا بەگیش لە قالە هەر ئەم بابەتەیە، مستەفا بەگ ئەتوانێ دڵی لە قالە بچێت، قالەش لەوانەیە کە مستەفا بەگ دڵی لێ بچێت بەڵام ئەگەر مەبەست لە دڵ لێ چونەکە ئیشی خراپە بێت ئەمەیان رێك ناکەوێت، چونکە سروشتنی قالە بۆ مصگفی بەگ بۆ ئەوە دروست نەکراوە. راستە ئەمە ئەبێت: کە کوڕێك دڵی لە کوررێك بچێ بۆ ئیشی خراپەو داوێن پیسی، هەر کە کردی ئەبررێتەوە ، ئەگەر هینەکەی مصگفی بەگیش بۆ ئەوە بوایە جارێ بێجگە لەوە کە لەماوەی بیست ساڵدا هەر ئەیتوانی بەو ئارەزوەبگا، ئەم سۆزە ئەوەندە نە ئەمایەوە کە کوردی بخاتە ئەو عالەمی ئەرواحەوە و بەجۆرێ تیایانا ون ببێ کە ناوی قادری خاوەن جێهان بەتاپۆی قادری چاو جوان بێنێتە مەیدانەوەو بڵێ:

*عبث کوردی! مەلائك دێن دەپرسن مذاهب و دینت*
*کەقادر خۆی دەزانێ من لە سەر کام مذهب و دینم!*

پرسیار کردنی فریشتە لە پاش مردن و لە گۆڕرادا ئەبێت، ئەمەش ئینکار ناکرێ کە کوردی ئەمەی زانیوە چونکە ئەڵێت((دێن)). هەر وەها، نە کوردی و نەغەیری کوردی ئەوەیان بەر گوێ نەکەوتووە کە لەدەوری ژیاندا فریشستە بێت و پرسیار بکات. کەوا بوو قادری چاو جوان ئەو دەسەڵاتە نیە کە دو فریشتە لە پاش مردنی کوردی بنێرێ بۆ پرسیار کردن، بەڵکو ئەڵێت قادری خاوەن جێهان- کە دورستی کردوم- خۆی ئەزانێ کە من لەسەر چە

ڕێگەیەکم ئیتر ئەم پرسیارە چیە ئەیکا؟!.. جا ئایا عەشقێکی هەوەسرانی و ئارەزو پەرستی ئەتوانێ بگاتە ئەو پایەیە کە کوردی بخاتە کۆڕری ئەو فەلسەفەو تصوفەوە کە هەزارانی وەکو (معری وخیام منصوری تیایا مەی گێرر بوون؟!..

ئێمە لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە(کوردی)بو بە عاشقێکی لاهوتی، تەلی عاتفەی هیچ شتێك نایبزوێنێتەوە تەنها ئەو پەیکەرە نەبێت کە لە نیگاری قالە دا بوە بە ئاوێنەی جیهان نمی کوردی جا لەبەر ئەوە خۆی لەبەر هەر تەونێکا، کە دابنێ ئەبێت (تان)ە–کەی، یا(پۆ)ەکەی عەشق بێت!..

***

کوردی دەردە دڵێکی خۆی لەگەڵ یارەکەیدا باس ئەکات ئەڵێت:

***چێشتم ئەمرۆ ژەهری مارو ڕۆحی شیرینم نەهات***

***زەخمی کۆنەم هاتەژان و مەرهەمی برینم نەهات***

***من غەمم خواردو غەمیش خوێنی جگەرمی خواردەوە***

***بۆیە گریام چەند بە چەند فرمێسکی خوێنینم نەهات***

ئەڵێت: دوری یاری شیرینم بۆم بو بە زەهرو خواردمەوە.. هیچ بەزەییکی پیاما نەهاتەوە کە بێت و نەیەڵێ ئەو زەهرە بخۆمەوە.. زۆر دەمێکە بەداوی ئەوەوە گرفتارو بریندارم.. ئەو برینە کۆنەیەم کە دور کەوتنەوەی جاری پێشوی ئەوە– هاتەوە سوێ و نەهات بۆ ئەوە ئەو هاتنەیم بۆ ببێ بەمەڵحەم ..من لەداخی دوریەکەی دەستم کرد بە خەم خواردن و ئەمویست بگریم و فرمێسکی خوێنین هەڵرریژم.. بەڵام لەبەر ئەوە کە غەمیش وەکو ((زەروو))، خوێنی جگەری خواردبووم هەر چەندم کرد دڵۆپە خوێنێکم چنگ نەکەوت بۆ ئەوە بیکەم بە فرمێسك!!..

کەم کەس توانیویەتی بەم جۆرە باسی خۆی و غەم و یاری بکا وەکو کوردی کردویەتی. لە پاشا ئەیهێنێتە سەر ئەوە ئەڵێت:

***گوێ سەرم چەوگانی میحنەت دایە بەر خۆی رای فرراند***

***العجب بو، شەهسەواری خانەی زینم نەهات؟!***

لێرەدا بە راستی کوردی وەستایەتی بەکار هێناوە، یەکەم لەوەدا: گۆیا سەرو کەللەی– کە شوێنی مێشك و فکریەتی– لەبەر نەهاتنی یاری وەها تێك چوەو پەکی کەوتوە وەکو تۆپی بۆشی جلیتێنی لێ هاتوە کە گۆچانی ئێش و ئازار بە هەموو لایەکدا هەڵیئەفرێتێ و هەڵیئەسوررێنێ. ئەڵێت ئەمە زۆر سەیر بوو" من ئەمەم بە سەراهات و کەللەی سەرم هەمو کەس یاری پێ ئەکرد کە چی یارم دیار نەبو" کە ئەویش وەکو شۆررە سواران لە ناو زینەکەی دانیشێ و گۆچانێك بگرێتە کەللەم!.. دوهەم کوردی بەم شعرە یاریەکی شەقێن و رمبازی و تۆپ بازی– کە لەو دەورەدا لە کوردەواری باو بوەو هەر هی کورد بووە– ئەیخاتەوە فیکری ئێمە. زۆر نزیکە ئاوروپاییەکان یاری(بۆڵۆ) یان لە کوردەوە وەرگرتبێ...

کوردی لەو شعرەیدا کە ئەڵێت:

***گەر مخیر بم لە مابەینی بە هەشت و وەصلی یار***

***وصلی تۆ، بۆ من، جەهەنەم پڕ لە جنت نامەوێ***

وردەکاریەکی کوردانە سەیری کردوە.. رو ئەکاتە یارەکەی ئەڵێت: ئەگەر بمکەن بەسەر پشك بۆ ئەوە کە گەیشتن بەتۆ هەڵگرم و جەحەنەم جێگە م بێ، یا دەست لە تۆ بشۆم و بە هەشتم بدەنێ. پێ گەیشتنەکەی تۆم ئەوێ نەوەك بە هەشتەکە!

کوردی ئەم بەیار گەیشتنەی ئەوەندە بە سۆز داوا کردوە ئەڵێت: نەوەك هەر ئەوەندە کە بەدەست لێ گیر بونەکەت بە هەشتم ناوێ!. بگرە لەبەر تۆ ئەوەندە لە بەهەشت دور ئەکەمەوە ئەگەر بێتو جەحەنەمیش– ئەو جەحەنەمە کە ئەگەر تۆم بوێ ئەبێت بەجێگەم پڕ بکرێت لە بەهەشت تەنانەت ناچمە ئەوێشەوە نەوەك پێم بڵێن تۆ ئەوا چوێتە بە هەشت ئیتر نابێت بە یار بگەیت!..

((کوردی)) سوچی قسەیەکی کوردی دەرخستوە کە یەکێك بە یەکێك ئەلێت: ((دە بررۆ جەحەنەمت لێ پرر!)) کابرا توررە ئەبێت لای وایە قسەیەکی ناشیرینیان پێ وتوە، هەر چەندە ئەو کەسەش کەقسەکە ئەکا لە کاتێکی توورییدا و بۆ ئەوە ئەیڵێ گۆیا جنێوی ئەداتێ کە چی لە حەقیقەتیشدا قسەکە لە مەبەستی هەردولایان دورە"چونکە((دە بررۆ جەحەنەمت لێ پرر)) یەعنی بررۆ جەحەنەمت لێ پرر کرا بێت بە هیچ جۆر جێ توێ تێدا نەبێتەوە. کە وا بو مەعنای شعرەکە ئەوە نیە نیە وەکو هەندێ کەس ئەڵێن: ((بە هەشت پرر بێت لە جەحەنەم نامەوێ)) ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ ئەڵێ: ((نەوەك هەر بە هەشتم ناوێ، تەنانەت ئەگەر جەحەنەمیش بۆ ببێ بە بەهەشت ئەویشم هەر ناوێ تەنها تۆ نەبێت. کەوا بوو کوردی لە باری ئەدەبیاتدا زەوقی لە گەلێك شاعر بەرزتر بووە□..

***

کوردی هەر لە خانەی عەشقدا دیواخانێکی دروست کردوەو بە بررە شعرە بەرزەکەی باسێکی ئاهەنگی ئەو دەورە بۆ تاریخ ئەگێررێتەوە. سەرەتاکەی ئەکاتەوەو ئەڵێت:

***دڵ لە میحنەت کەیلە ئەی پیری موغانی بەزمی ساز***

***هەر ئەتۆی بۆ بارەگای عەیش و تەرەب مەسنەد تەراز***

کە دیواخان لە کۆرری مەی نۆشان گەرم ئەبێت مەی و مەی گێرر ئەچنە ژوورەوە، ئینجا بە زاهدیش ئەڵێت قاپی مەیخانەو ئاهەنگ کراوەتەوە واز لە خانەقا بێنە پێیەك باوێژەرە ئەم دیوەوە!.. کۆڕما زۆر خۆشە " چاو مەستی کڵاو لار بە کاکۆڵی پەریشانیەوە بە نازێکەوە مەی ئەگێڕەو ئەو لێوانە ئەکا ئەو مەیە ئەخواتەوە!.. ئەڵێت هەر وتنی گوێندەکانمان نا تەواوە، دەبا:



*ئاغە زەنون لیٚ بدا سینە کەماتن فارس گرفت*
*ئەڵکە، تەنبورو دەف و اسعد بدا دەستی بە ساز*
*مستۆ ئیبراهیم و ئەوڕەحمان نەواو فەتحی حەزین*
*مستەفا ناری و سێ گا، یونس بڵێ دەشتی و حجاز*
*یا ڕەسوڵ هەڵداتە راست، ساڵح بڵێ: نیوەشەوی*
*محی دین چوار گاو قەرە، دەنگی بڵند کا بۆ قەزاز*
*جار بە جار بە گزێکەوە هەستێ لە پەردەی تا هری*
*یارەکەی عاشق کوژەو مەعشوقەکەی دوشمن نەواز*

لە پاشا دێنێت (باربود) و(ئەیاز) و (نەکیسا)ئەکا بە گاو گەردونی ئەمانە، ئەڵێ دیواخانی وا گەرم (جەمشێد) ئەکا بە گاو گەردونی ئەمانە، ئەڵێ دیوەخانی وا گەرم جەمشید) ئەبێت ببێ بە قاپی وانی، کەوا بو صوفی و شێخ زاهد نابێت بێنە ژورەوە، هەژارانەلێیان پەشیمان ئەبێتەوە! و ئاخری شعرەکانی بەوە دێنێت ئەڵێت:

*وە نیە کوردی مائلی ئەو نەوعە ئەتوارانە بێ*
*لازمە شاعر لە هەر نەوعی بڵێ بۆ ئیمتیاز*

تەماشا ئەکەی کوردی لەو شعرانەدا وێنەیەکی بەزم و ئاهەنگی ئەو ڕۆژەی سولەیمانی و کوردەواری ئەگێڕرێتەوە“ یەکە یەکە ناوی گوێندەکان دێنێ لەگەڵ ئەو گۆرانیانەدا کە ئەو سەر دەمە باو بوون. لە پاشیشا نەفسیەتی خۆی بە تەواوی دەر ئەبرڕێ.

ئێمە لێرەدا ئەبێت بکەوینە سەر ئەو باوەررە کە ئەگەر سۆزی عەشقی کوردی نەبوایە نەمان ئەتوانی ئاگاداربین بەسەرمەقام و موزیقا و چۆنیەتی ئاهەنگی زیاتر لە سەد ساڵ لە مەوپێشتر لە کوردەواری دا، کە ئیمڕۆژ ئەم ناحیە پایەکی زلی هەیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا.. دیسان ئەبێت ئەوەش بزانین کە لە سەدەکانی رابوردودا کورد لە گەڵێ شتدا شان بە شانی قەومەکانی تر ڕویشتون..

سۆزی قەومیەت لە مستەفا بەگدا کردویەتە کارێ کە ناوی شعری بکا بە (کوردی). لە تاران ناو ونیشانی خۆی ئەکا بەم نیوە شعرە: احمد جدو پدر محمود و نامم مصطفی است))و ئەیخاتە سەر نقێمی ئەنگوسیلەکەی بۆ مۆر..

لەو شعرانەدا کە لە وڵاتی ئێران وتونی غەزەلیاتێکی زۆری بە زمانی فارسی هەیە بەڵام دەستاو دەست کەوتوەو کۆ نەکراونەتەوە. دیوانێکی کەمی بە زمانی کوردی لەلایەن((کوردی مەریوانیەوە)) لە چاپخانەی((دار السلام)) لە بەغدا ساڵی (1931) بۆ جاری یەکەم لە چاپ دراوە..

زیادەی دوەم:

بۆ جاری دووەم لەلایەن گیوی موکریانیەوە لە هەولێر لە ساڵی 1961 چاپ کراوەتەوە. دیسان لە لایەن ((سیدیان) لە مەهاباد

چاپی کردوەتەوە بەبێ ئەوە تاریخی لەسەر بێت، بەڵام پاش ئەوەی گیو کەوتوە.

# ئەدەبی کوردیو میسریی کۆن

ئەدەبی میسری لەوانەیە لە کۆنیەتی دا هاوشانی ئەدەبی کەلدانی بڕوا. کۆنترین شتێك کە لە میسریە کۆنەکانەوە مابێتەوە(کتێبی مردوان)ە کە لە دەوری دروست کردنی هەرەمە گەورەکەی میسردا لە سەر توێکلّی(بەردی)- کە گیایەکە وەکو قامیش لە توێکلّەکەیان ئەنوسی- نوسراوەتەوە، ئێستەش نوسخەیەکی لە مۆزەخانەی بەریتانیادا هەر هەیە.. لەوێدا لەپێشا باسی پاڕانەوە لە خوا ئەکا لەگەڵ پەستەی نوێژ کردندا، لە پاشا دێتە سەر ئەوە کە لەرۆژی دوایی‌دا لێ پرسینەوە هەیە و ئەرواح ئەهێنرێتە ژێر حسابەوە. نوسخەیەکیان لەمە ئەنوسیەوەو لەگەڵ مردوەکەدا ئەیاننایە گۆڕەکەوە!..

لەمەوە ئەوە بۆ ئێمە دەرئەکەوێ کە فیکرەی ئەدەبی لە میسری کۆندا لە بەینی چوار دیواری پەرستگاکانەوە دەرچووە و بەشی زۆری ئەدەبی میسری لەسەر ڕێ و شوێنی ئایینی بووە.. لەم روەوە میسری کۆن و کورد- چە کوردی کۆن، چە تازە- لەدوشتا وەکو یەکن، یەکەم چۆن لە میسردا فیکرەی ئەدەب سەرەتا لە پەرستگاکانەوە چوزەرەی دەرکردوە، لەکوردیشدا هەروا بووە. تەنانەت هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیش ئەدەب لەکوردەواری‌دا چە ئەدەبی فەلسەفی، چە غەرامی، چە عیلمی هەر لە ناو چوار دیواری مزگەوتەکانەوە سەری هەڵداوە.. دوەهەم لەوەدا وەکو چۆن دیواری مزگەوتەکانەوە سەری هەڵداوە.. دوەهەم لەوەدا وەکو چۆن ئەوان نوسخەیەك لەو نوسراوەیان لەگەڵ مردوەکەدا ئەخستە گۆڕەکەوە لە کوردییشدا- دیارە کە ئەڵێن کورد زۆرتر بۆ رەوشت و عادەت کۆچەری و لادێ نشینەکانمان مەبەستە- ئەو کەسە لە دەوری ژیانیا لە وردە بابەتی ناو ماڵ زۆرتر چی خۆش بویستایە لە گەڵی ئەیاننایە گۆڕەکەوە.

ئەم کردەوەیە هەر چەندە هەروا بە ساویلکەیی ئەکراو ورد نەکراوەتەوە بەڵام ئەوە پیشان ئەدا لە بیرو باوەڕی کۆنیانا هەر بڕوایان بە زیندووبونەوەو حساب بووە، وەکە حسابی دنیای لێ داوا کرا، گۆیا بڵێت من هەر شتێکم کردوە لەبەرئەم شتەم کردوە کە ئێستە لەبەردەستمایە، وا لەگەڵ خۆمم هێناوە!.. ئەم فیکرە هەر وا بە ساویلکەیی هاتۆتە خوارەوە بەڵام سەرەتاکەی ئاوا بووە. دیسان تەنانەت ئێستەش لەهەندێ لە کۆچەریە دورە دەستەکانا مردو لەو وەختەدا کە گیانەکەی دەر ئەچێت لە وەختی ژیانیا چە جۆرە ئیشێکی بوو بێت لەسەر مەرگەکەدایدا شتومەکی ئەو ئیشەی ئەخەنە دەستەوە، ئەگەر ماڵاتی بە خێو کردبێت گاڵۆك، ئەگەر جەنگاوەر بوبێت خنجەر، ئەگەر میرزا بوبێت قەڵەمێك ئەخەنە دەستیەوە!. من خۆم لە کوردەکانی (کۆماین) دا چاوم پێ کەوت کابرایەك مرد لە سەرەمەرگەکەیا گاڵۆکێکیان خستە دەستیەوە.. دور نیە ئەم فیکرەشە هەر وەکو فیکرەی پێشو بێت..

ئینجا ئەمە نمونەیەکە لە((کتێبی مردوان))ی میسری کۆن:

((سەلامت)) لێ بێ ئەی خوای گەورەو راست، هاتۆم! ئەی خوا بۆ ئەوە شاهدی بدەم لە سەر گەورەییت، هاتۆم ئەی خوا! خۆم بە خشڵی حەق رازاندۆتەوەو دور کەوتومەتەوە لە ناهەق، جەورم لە کەس نەکردوە، ڕێچکەی پیاو خراپانم نەگرتوە، سوێندم بە درۆ نەخواردوە، ئارەزو هەڵی نەخەڵەتاندۆم بۆ ئەوە چاو ببڕمە ژنی خزمێکم، دەستم بۆ ماڵی کەس درێژ نەکردوە، درۆم نەکردوە، نافەرمانی تۆم نەکردوە، خۆمم بەوەوە خەریك نەکردوە کە قولێك لە بەرچاو ئاغاکەی بخەم و ئاغەکەی لێ توورە بکەم، نە لە کەسم داوە نە ئێشم بە کەس گەیاندوە، کەسم نە کوشتوەو ناپاکیم لەگەڵ کەس نەکردوە، بەڵکو کەسیشم هەڵنەخڕاندوە بۆ ئەوە کەسێکی تر بکوژێت، نانم لە مزگەوت نەدزیوە، ماڵم لە کەس داگیر نەکردوە، بێ قەدەوی- بێ ئەدەبی- م بەرامبەر بە مردوان نەکردوە، قسەی خراپم بەدەما نەهاتوە، شتێکی پیرۆزم پیس نەکردوە، گەنمم بە نرخێکی گران نە فرۆشتووەو ترازوبازیم نەکردوە، من پاکم، من پاکم، من پاکم. تا مابوم لە گوناح دور بوم. خوایە لە ریزی سەرکەوتوانی لای خۆتا دام بنێ))..

لە بن دەست ئەم ئەدەبەوە ئەو ئەدەبەشیان بووە کە بە سەرو باڵای پادشاکانیانا هەڵدا بێت و لەسەر زمانی شەعبەکەوە ئەفسانەوە حکمەت و یاساشیان بوبێت. لەم روەوە کتێبی(وصایا) یان هەیە، کەهی (بەتاح حوتەب)ە.. لە چیرۆکی شدا کۆنتر چیرۆکی میسری کۆن حەقایەتی(ئوزیریس)و(ئیزیس)ە .. بە کورتی ئەم چیرۆکە:

(ئوزيريس)ڕەوانـە كـراوی خـوا بـو كـە داد لەسـەر زەوی دا بـڵاو كاتـەوە، مـەردمی فێـری كشتو كاڵ و دۆزينەوەی (كان) كرد. (تحوت) خوای زانينو زانياری ئەم شتانەی فێر ئەكرد، ئينجـا ويسـتی بـە هـەموو سـەرزەوی دا بسوڕێتەوە بۆ ئەوە ئەو ڕاسپێريە بگەيەنێت، خـۆی بـە لـە شـكرێكی زۆرەوە رويشـت و(ئيزيس)ی ژنی لەسەر تـەختی ميسرەوە لە شـوێن خـۆی دانـا، ئيشـی خـۆی كـردو گەڕايـەوە. برايـەكی هـەبوو (سيت)ی نـاوبوو. (سـيت) ويسـتی(ئـوزيريس) لەناوبـەرێت! هێنـای بانگێشـتنێكی بـۆ كـردو گـەڵێ لـەپياوە گەورەكانيشـی كـۆكردوەوە، لـە ژوری نـان خواردنـدا سنوقێكی بـەنرخی نـەخش كـراوی بـە ئـاڵتون و زومـروت دانـا، هـات بـە دانيشـتوەكانی وت: هـەر كـە چـوە نـاو ئـەم سـنوقەوە پـڕی بـو ئەيـدەم بـە خـۆی!. دانيشـتوەكان يەكـە يەكـە خۆيانيـان تـاقی كردەوە سنۆقەكە لـە ئەنـدازەی كەسيانا نـەبو. سەرە هاتە سەر (ئوزيريس) كەئەو چوە ناوی پـڕ بـە پـڕی دەرچـو!.(سـيت)و دەسـتو پێوەندەكـەی هـاتن سـەری سـنوقەكەيان داخسـتو مشـەمايان تـێ گـرتو خسـتيانە روبـاری(نيـل)ەوە!. ئـەم بـاس و خواسـە بـڵاو بـوەوە تـا بـەر گـوێی(ئيـزيس) كەوتـەوە. زۆر خەمگين بـوو پـەژارە دايگرت، هەستا دەستی كـرد بـە گـەڕان لـە(نيـل))دا دۆزيـەوە هێنـای لەشـەكەی (ئـوزيريس)ی لێ دەرهێنـا گـۆڕێكی بـۆ هەڵكەنـدو ناشـتی. (سـيت) ئەمـەی پـێ خـۆش نـەبو، چـو لەشـەكەی لـە گۆڕەكـە دەرهێنـاو پارچـە پارچـەی كـردو هـەر پارچـەيەكی فڕێدرايـە شـوێنێك.( ئيـزيس) ديسـانەوە دەسـتی كـردەوە بەگـەڕان، هـەر پارچـەيەكی لەهـەر شـوێنێك ئەدۆزيـەوە هـەر لەوێ دا گۆڕێكی بۆ هەڵئەكەندو ئەيناشت و دا ئەنيشـت بەسـەريەوە ئەيلاوانـدە. ئينجـا لەگـەڵ (حـوريس)ی كوڕيـا هانـا ئەبەنـە بـەر خواكـان، ئـەوانيش(سـيت) لـە پادشـايەتی ئەخەنو(حوريس) لەشوێن باوكی دائەنێن)).



ئەم چیرۆکی(ئوزیریس)و (ئیزیس)ەو پەرستنیان لە میسرییەکانەوە پەرەیسەندو کەوتە یۆنان و رۆمان. لە سەدەی چوارەمی پێش میلاد لەدۆڵی (پیریە) لەیۆنان پەرستشگاهێك بۆ( ئیزیس) دروست کرا. دیسان لە ((پوزول)) لە لەنی ئیتالیشدا لە رۆمان پەرستگاهێکی تریان بۆ دروست کرا، لە(بۆمبی)یش یەکێك بۆ (ئیزیس) دروست کرا، لەوێشەوە ئەم پەرستنە گەیشتە ئەسپانیا و فەرەنسا و ئینگلتەرە. لەسەر ئەم باسە نوسەرەکان زۆر رۆیشتون..

میسرییە کۆنەکان وەکو چۆن لە ئەدەبی چیرۆکی دا هەنگاویان هاویشتوە هەروەها لە ئەدەبی نەفسی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاینیشدا ئەو هەنگاوەیان هاویشتوە. جا بەو بۆنەوە ئەمە نمونەیەکە لە ئامۆژگاریەکانی (بەتاح حوتەب–3500) پێش میلاد، بۆ کوڕەکەی:

*(ئەگەر ئەتەوێ خەڵك چاکەت بڵێن خۆت لە چڵێسی و تەماع بپارێزە، چونکە چڵێسی دەردێکە دەرمانی نیە هاوڕێتی لە گەڵا ناگیرێت. هەرچێ خراپەیە لەودا کۆبۆتەوە، تورەکەی هەموو سوکیێکە.. ئەگەر لە پاش زەبونی گەورە بویت و لە پاش هەژاری دەوڵەمەند. وریا بە زەمانی، زەبونی و هەژاریت لە بیر نەچێتەوە، کۆششی خۆت بخەرە سەر زانینو قسەی بە ڕێ و جێ. لە پێش ئەوەدا فەرمان بەشتێك بدەیت فیکری لێ بکەرەوە، هەڵەشەیی زۆر خراپە، ئینجا کە فەرمانەکەت دا لە خۆت بایی مەبە، لە قسەو فەرماندا توندو تیژی مەنوێنە، هەمو دەم بە شوێن ئەوەدا بگەڕێ کە فەرمانت نەشکێت، هێمنی گەلێ کۆسپ تەخت ئەکا، توڕەیی ژیان تاڵ ئەکا).*

*ئەمەش نمونەیەکە لە ئامۆژگاری سیاسی کە(خیتی سێیەم) ئەیکات بۆ کوڕەکەی کە(خیتی چوارەم)ە: ..(قسەزان و زمان پاراو بە هێز ئەبیت، زمان بۆ پادشا چاکترو بە کەڵکترە لە شیر بۆ شەڕ، پیاوی ئیشزان و لێهاتوو بخەرە سەر ئیش چاوت لەوەوە نەبێ کە کوڕی پیاوی گەورەیە، یا بچوك. دەست بگرە بەداوێنی دادو عەدلەوە، وریابە خراپە لەگەڵ هەتیو وبێوەژنان مەکە، یەکێ میراتێکی لە باوکیەوە بۆ ماوەتەوە دەستی بۆ درێژ مەکە، تا گوناح لە یەکێك نەبینی جەزرەبەی مەدە).*

*نمونەیەك لە پەستەی گۆرانی شەعبی میسری کۆن:*

*(نەخۆشم هیچ نەخۆشیەکیشم نیە، دراوسێکانم سەرم لێ ئەدەن. خوشکەکەشم هەر سەرم لێ ئەدا. گاڵتەی پێ دێت کە پزیشکەکانم ئەبینێت چونکە ئەزانێ دەردەکەم بە وان چار ناکرێت. ماڵی خوشکم . بریا دەرکەوانی ماڵەکەی بومایە بۆ ئەوە ئەگەر بەمە توڕە ببوایە گوێم لە دەنگی توورەییەکەی ببوایە. وەکو منداڵێك لەبەردەم یەکێکا بوەستێو زۆر شەرمی لێ بکا بەو جۆرە لەبەردەم خوشکما ئەوەستام !( میسرییە کۆنەکان بە دۆستیان ئەوت خوشك–*

*نمونەیەك لە غەزەلی کچی میسری کۆن:*

*(من کە بیرت لێ ئەکەمەوە دڵم ئەلەرزێ و دەست ئەکا بە تەپ تەپ، خۆشەویستی تۆ وام لێ ئەکات لەو ژیانەم دەر ئەکا کە هاورێکانم تیایا ئەژین. نازانم چۆن جلەکانم لەبەرکەم؟ چۆن شتومەکەکانم رێکخەم. چۆن چاوم برێژم و چۆن خۆم بۆنخۆشکەم؟؟)...*

*لە ئەدەبی غەرامی میسری کۆندا گەلێ جار رەشایی موی دۆستیان کردوە بەتاریکی شەو، و بریسکەی ددانەکانی بەو پڕشەو شەوقە کە لەبەرد ئەبێتەوە. ناوی باڵای بەرزو سنگی تەڕ مەمکی خڕیشیان هێناوە..*

ئینجا ئەدەبی کورد بەرامبەر بە ئەدەبی میسری کۆن:

وەکو وترا ئەدەبی کوردی نەنوسراوەتەوەوە هەڵنەگیراوە، تەنگو چەڵەمەی زەمان و ژێر دەستەیەتی هەموی لە ناو بردوە. بۆ ئەوە کە ئێمە بتوانین ئەدەبێکی زۆر کۆنی کورد بەرامبەر بە ئەدەبی ئایینی میسری کۆن پیشان بدەین هەر ئەوەمان بەدەستەوەیە کە چەند رەوشێکی بیرو باوەڕی ئایینی– کە ئێستە لەناو کورددا ماوەتەوە– بخەینە بەرچاو و لەمەوە فیکرەی دەورێکی زۆر کۆنمان بۆ دەرئەکەوێ: کە کورد بەرامبەر بەبیرو باوەڕی خواپەرستی چ فیکرەیەکی بووە؟. یەکەم فیکرەی شەخس– قسن، دوەم بەردی کێل، سێەم شتی مزگەوت..

جارێ لە پێش ئەمانەدا تیرەی یەزیدی– کە یەکێکن لە تیرەکانی کورد– ئەوان لە هەموو کەس زیاتر ئاگاداری بیرو باوەڕی ئایینی کۆنی کوردیان کردوە. کە ئەڵێن ئاگادارییان کردوە، واتە تۆزی لەسەری ماونەتەوە ئەگینە بەهۆی نەبونی خوێندەواری لەناویاناو نەنوسینەوەی ئایینەکە ئەویش هەر تێکچوە، بەڵام شتێکی لێ هەر وەر ئەگیرێت.

ئەوان لەمەبدەئی ئەساسیدا بڕوا بە ئاهورامزا ئەهریمەن ئەکەن، ئەویان بۆ خێرو ئەمیان بۆ شەڕ. و لە عەناسردا روناکی و تاریکی بروا پێ ئەکەن کە ئەمانە بناغەی ئایینی زەردەشتە.پاکژی ئەم ئایینە سێ شتە: .چاك بڵێ، فیکرت چاك بێت، کردەوەت چاك بێت)). مەبەست بە چاك وتن ئەوەیە ئینسان پەیمان بەجێ بێنێ، قەرز بداتەوە، ئەوی چاکە بۆ خەڵك ئەوە بڵێت، بە قسە مەردم ئازار نەدا... مەبەست بە فیکری چاك ئەوەیە کە پیاو فیکری بخاتە سەر خواناسی، لە ناو مەردما ڕوخۆش قسە خۆش بێت، لە وەختی ترسا ئاگای لە مەردم بێت، خەڵك فێری خوێندەواری بکا، ڕێگەی چاکەیان بۆ دانێت... مەبەست بە کردوەوەی چاکەش ئەوەیە کە یارمەتی هەژار بدا، کشتوکاڵ بکا، ئاوی شیرین و خۆش بۆ خواردنەوە بژێنێتەوە، کۆشش بکا بۆ ئاسانکردنی ئەو ڕێگایانە کە ژیانی ژن و مێردایەتی ئاسان ئەکەن، ئەوی لە خۆی زیادە لە ڕێگەی چاکەدا بڵاوی کاتەوە. ئایینی زەردەشت رقی لە پیاوی تەمەڵ و تەوەزەل ئەبێتەوە، زۆر خەریکی کشتوکاڵ و دارناشتن و ماڵاتداری

ئەبێت. ئەم سێ شتەیان ئایا لەبەر ستراتیجی کوردەواری بێت، یا لەبەر ئەو پابەندە کۆنەیان بێت بە ئایینەوە کورد زۆر خەریکی ئەبن.

ئینجا شتەکانی پێشوو: فیکرەی شەخس- قسن. ئێستەش لە کوردەواریدا باوە ئەگر پیاوچاکێکی گەورە مرد لە پاش ئەوە کە ناشتیان پەڕۆی سەوزو سپی ئەکەن بە بەیداخ و لەسەر گۆڕەکەی ئەیچەقێنن، ڕێبوار و خەڵکی تر دێن تیلمە تیلمە لەو پەڕۆیە ئەکەنەوە و ئەیبەن بە مفەرك. وەکو ئەیبەن، بۆیشی دێنن.. ئەم ڕەوشتە بە پێی گێڕانەوەی پێشینان کە بەرە بەرە لە یەکیان بیستووە ڕەوشتی پێش ئیسلامەتیەو لەناو کوردا ماوەتەوە. ئەوان هەر ئەوەندە ئەگێڕنەوە وهەر ئەوەندەیان ئاگا لێیە، بەڵام کە پیاو لێی بکۆڵێتەوە ئەوە دەرئەکەوێ کە: کورد لە بیرو باوەڕی ئایینی کۆنیانا پیاوچاکەکانیان بە مظهری نوری خوازانیوە، تا لەدنیادا بوون ئەوە ڕێزیان لێیان گرتون، کە لە دنیاش دەرچون بە لایانەوە وا بووە کە ڕۆح ئاشنایەتی لەگەڵ لەشەکەدا ناپچڕێت و هەموو دەم وەکو پەپولە بە دەوریایە. چەقاندنی ئەم بەیداخانە نیشانەی ئەوەیە کە ئەمانەی لە دنیادا ماون وەکو ڕۆحەکە چۆن ئاشنایەتی لەگەڵ لەشەکەدا نە پچڕاوە ئەمانیش بەو جۆرە هەر نە پچڕاوە، کە ڕۆحەکە ئەمەی دی بەرامبەر بەمان ئەو مهرەبانی و پارێزگارییە لە دەورێکا لە، لە شەکەدا بووە بەرامبەر بەمان نواندویەتی ئێستەش هەر ئەینوێنێ و ئەو تیلمانە لەبەر ئەوە کاتێك کە لەسەر گۆڕەکە بووە بۆنی ڕۆح و لەشەکەی گرتوە کە کەوتە هەرماڵێکەوە ڕۆحە ئەچێ بە شوێنیاناو ئەو ماڵە پیرۆز ئەکات...

***کێل:-*** هەندی لە پیاو چاکە مردوەکان- لە بیرو باوەڕی کوردەواری دا- ژنان ئەچنە سەر گۆڕەکانیان مرازیان پێ ئەگرنەوە، ڕێزە بەردێك لەسەر گۆڕەکە هەڵئەگرن و لە دڵیانا مرازەکەی خۆیان ئەڵێن و بەردەکە ئەنوسێنن بە کێلەکەوە، ئەگەر وەکو ئاسنکێش کێلەکە ڕیزەبەردەکەی وەرگرت و گرتیەخۆی ئەوە مرازەکە جێ بەجێ ئەبێت، ئەگەر خۆ نەیگرت ئەوا هیچ... ئەم کردەوەیەش وەکو هی قسنەکە هەر مظهرێکی ڕۆحییە بیرو باوەڕی ئایینی کۆن پیشان ئەدا...

***مەسەلەی مزگەوتەکەش:-*** ئێستەش ئەو قسەیە هەر هەیە لە ناو کوردا ئەڵێن: ئەگەر چیلکەیەك لە ماڵی مزگەت کەوتە ماڵی هەر کەسێکەوە ئەو ماڵە ئاگری تێبەر ئەبێت. جا لەبەر ئەمە ناوێرن بۆ دزی و درۆزنی تۆخنی مزگەوت بکەون... من لام وایە ئەمە ڕەوشتێك بێ هی پێش ئیسلامەتیە ماوەتەوە، لە پێشا بیروباوەڕی ئایینیان بەرامبەر بە پەرستشگا وا بووە، کە ئیسلامەتی هات ئەو بیروباوەڕە لە پەرستشگاکان کەوتە سەر مزگەوت. بۆیەش ئەڵێم هی پێش ئیسلامەتیە چونکە ئەم باوەڕە زیاتر لە ناو ئەو کوردانەدا بڵاو بوتەوە کە دورن لە شارو لادێ و لەو شوێنانە کە پێشەوای ئایینی ئیسلامی تێدا هەیە...

بەرامبەر بە چیرۆکی(ئوزیریس)و (ئیزیس)ی میسری، چیرۆکی (پوشین) و(پامێر) هەیە لەکوردی دا، بەڵام لە چەوەخت دەورێکدا بووە ئەمە نازانرێت، ئەوەندە هەیە کەینوبەینەکە دەورێکی زۆر کۆن پیشان ئەدات. بەکورتی چیرۆکەکە ئەڵێت:

((پادشایەکی زەبەر بە دەست هەبو لە شارێکا قەڵەمرەوێکی زۆری هەبو، شارەکەش مەردمێکی فرەی تێدا بوو، ئەو شارە تەنیا کانیاوێکی هەبو، میراوی لەسەر هەبو خەڵکەکە بە نۆرە ئەهاتن بۆ ئاو. ڕۆژێك هەراو زەنا کەوتە شارەوە. پادشایان تێگەیاند کە(دێو)ێك چوە میراوی دەرکردوەو بەر کانیەکەی گرتوە نایەڵێ کەس بەلای ئاوەکەدا بچێت! ئەوا ئەهلی شار هەموو لەتینوانا وەختە بخنکێن. پادشا بە خۆی و پاڵەوان و سوپاوە چونە دەرەوە بۆ چارکردنی دێوە، سەیریان کرد وادێوە کە لەبەر کارێزەکەدا لێی کەوتوەو ئەبۆڵێنێ و ئاوەکە پەنگی خواردۆتەوە بووە بە دەریاچەیەك. پادشا پاڵەوانێکی ناردە



سەری، دێوە هەر پەلێکی بۆ درێژ کرد گرتیو خستیە ژێردانی هەر بە کاڵی کرمانی!. یەکێکی تر و یەکێکی تر چو هەموی خواردن، بەم جۆرە دە کەسی لە ناو بردو تۆزێ ئاهێکی تێکەوت، ئینجا بۆڕانی وتی: ئەی پادشا ئەگەر هەر بە چل ڕۆژ چوار منالم ئەدەیتێ بیکەم بە کەباب و بە مەزە، باشە ئەگینە ئەم ئاوە بەرەڵا ناکەم هەتا ئەبێت بە دەریایێك ئەو وەختە بەرەڵای ئەکەمو ئەبێت هەمو شارەکە ئاو بیبا، و ئەگەر هەر کەسیش بێت بەلاما بەو جۆرە ئەیخۆم!. پادشا لەگەڵ پیاوە ژیرەکانیا کەوتنە راوێژ کردن، هاتنە سەر ئەوە کە هەر بە چل ڕۆژ چوار منالی بدەنێ ئەوە باشترە لەوە کە هەمو خەڵکی شارەکە، یا لەبەر لافاو، یا لەبەر بێ ئاوی بخنکێن. پادشا بە دێوەی وت باشە چیت ئەوێ ئەتدەمێ و ئاوە کە وردە وردە بەرەڵا کە. هەر ئەوکاتە جارێ چوار منالیان دایە!. ئەویش هێدی هێدی لە شوێن خۆی بزوت و منالەکانی هەڵگرت و ئەشکەوتێك بو لە سەراوردی شارەکەوە روی کردە ئەشکەوتە کە رزگاریان بو. ئیتر هەر بەچل ڕۆژ ئەبوایە چوار منالیان بۆ بناردایەتە بەرقاپی ئەشکەوتەکە!.

ئەم ئیشە چەند ساڵێك بەم جۆرە مایەوەو منالی لەشارەکە بڕی و جەرگی هەموو کەسێکی سوتان، هەچ پاڵەوان و قارەمانێك لەولاتەکەیا هەبو نەیانتوانی چارێك بۆ ئەم دەردە بدۆزنەوە، پادشاو ئەهلی شار ئێجگار کەوتنە ناخۆشی و پەلوپۆیان لێ بڕا.. جاڕیاندا بە هەمو ولاتدا هەرکەس بتوانێ چاری ئەم دێوە بکا هەر شتێکی بوێ پادشا ئەیداتێ.. ڕۆژێ سەیریان کرد وا کوڕە گەنجێك لە دورەوە روی کردە ناو شارو روەو بارەگای پادشاهی خۆی کوتا. کوڕ نی یە کەڵەگەتێکی بالا بەرزی ناوسنگ پان، هەر باسکێکی ئەڵێ کۆڵەکەیەو شیرو تیرو رمو قەڵغانی لە خۆی داوەو چوە ژورەوە. وتی: پادشاهم! من ئەم بەلایەتان لەسەر لا ئەبەم، بەلام نیازێکم هەیە ئەبێ بەجێی بێنیت!. پادشا وتی باشە بڵێ، وتی:

من((پامێڕ)م ناوە، کچێکی ئامۆزام لەم شارەی تۆدایە((پوشین))ی ناوە، دەمێ ساڵە دڵمان بە یەکەوەیە، ئێستە مامەکەم نامداتێ و ناشمەوێ بە کوشتن و بڕین لێی وەرگرم ئەمەوێ ئیشەکە بە خۆشی ببرێتەوە، ئەگەر ئیشێکی وا ئەکەی مامەکەم کچەکەم بداتێ ئەوا باشە. ئەگینە هەر ئێستە ئەگەڕێمەوە!. پادشا وتی: باشە چیت ئەوێ بۆت جێ بە جێ ئەکەم ئینجا(( پامێڕ))وتی کە گەیشتە سەر چڵ ڕۆژە منالەکانی بۆ مەنێرن، با دێوەکە بێتە دەرەوە ئەو وەختە چاری ئەکەین. کەچل ڕۆژ بەسەر چو دێوە منالی بۆ نەچو. ئەهلی شار ئەوەندەیان زانی دێوەکە بە بۆڵە بۆڵو بۆڕە بۆڕ لە ئەشکەوتە کە هاتە دەرەوەو روی کردە سەر کارێزەکە، خەڵکەکە هەموو زەنەقیان چو!.(( پامێڕ)) وتی بە پادشا، با ئەهلی شار هەموو لەدەرەوە راوەستن و سەیری ئەم کارەساتە بکەن. تێکڕا مەردمی ناوشار هوروژمیان برد بۆ دەرەوە، ((پوشین))یش لەگەڵ مەردمی تردا چوو هەمو وەستان...

ئینجا ((پامێڕ)) خۆی لە دێوە نزیکخستەوە و پەلاماری دا، دێوەش دەستی راکێشا بۆ ((پامێڕ)). ((پامێڕ)) شیری داهێنایەوەو دای لەمەچەکی دێوە، سەیری کرد وەکو ئاسن زرنگەی دێ و شیرەکەی پەڕی!. هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی کوژرام! ئینجا رمی بۆ هاویشت، رمەکەش شکا. بەگورزێ هاتە وێزەی هەرچێ گورزی لێ ئەدا هەر دەنگ ئەداتەوەو هیچی تر!. پاشان کەوتە زۆران گرتن. یەکتر دێنن و ئەبەن،(پامێڕ)) شەکەت بوو دێوە هێشتا هەر تازە پشووە! ئەهلی شار بە تەواوی ورەیان بەردا یەکە یەکە وا خەریکن هەڵدێن!.

((پوشین)) کە ئەبینێ وا دڵخوازەکەی بەو جۆرە کەوتۆتە داو، ئۆقرەی لێ هەڵگیرا، نە ئەتوانێ بچێ یارمەتی بدا، نە ئەشتوانێ چارێك ببینێتەوە، بە ئاشکراش ئەبینێ ها ئێستە دێوە((پامێڕ) بدا بە زەوییدا و بیخوا، ها تۆزێکی تر! سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان نزای ئەکرد کوتوپڕ چاوی کەوتە قاپی ئەشکەوتەکە سەیری کرد وا قەفەزێك لەو دیوی قاپیەکەوەیە شتێکی تێدایە لەپیرێژن ئەکات! هەردچەندە ئەو دەم ئەدا بە یەکات فو ئەکات بەسەر دێوەکەدا، هەرچەند ئەو دەم ئەدا بە یەکا لێرەوە دێوەکە بەهێزتر ئەبێت!. وتی ببێ و نەبێ هەچ شتێك هەیە لە ژێر سەر ئەم قەفەزەدایە، خۆگیانی من لەگیانی پامێڕ زیاتر نیە، من ئەم ژیانەم ناوێ کە لەبەر چاومەوە ئەم دێوە دەست بخاتە جەرگ و دڵی پامێڕی خۆشەویستمەوەو دەری بێنێ. ئەمەی وتو ڕای کرد بۆ بەرقاپی ئەشکەوتەکە. ڕۆیشت، ڕۆیشت هەتا نزیك بوەوە لەو کاتەدا دێوە هەستی پێ کرد!. دەستی لە پامێڕ هەڵگرتو چو بە شوێن((پوشین))دا.. پامێڕ، کە سەیری کرد دێوە دەستی لە یەخەی بەردا و ڕای کرد سەری سوڕما، کە چاك تەماشای کرد وا ((پوشین)) وا بەڕێوە بۆ ئەشکەوتەکە ئەچێت و دێوەکەش بۆ ((پوشین)) ئەچێت!.. کە ئەمەی دی ئاگری تێ بەر بوو ئەمیش ڕای کرد بەشوێن دێوەکەدا بەلام چۆن ڕا کردنێك. دەست لەسەر شان!.

بەم جۆرە هەمویان لە نزیك قاپی ئەشکەوتەکە یەکیان گرتەوە. دێوە دەستی درێژ کرد بۆ((پوشین))و ((پامێڕ) لەپشت سەریەوە.((پوشین))بانگی کرد: ((پامێڕ!)) خەمی منت نەبێ بەڵکو خۆت بگەیەنیتە ئەو قەفەزە کە لە ناوەوەی ئەشکەوتەکەدایە. ((پامێڕ)) خۆی کرد بە ئەشکەوتەکەدا قەفەزەکەی بەرچاوی کەوت هەر دەستی پێ گەیشت دێوەکە لەم لاوە سارد بوەوە هێزی تیا نەماو کەوت!..((پوشین)) نەوی لە شاخی ئەیویست رایکێشێ بۆ لای پامێڕ بەلام لەبەر گران بۆی کێش نە دەکرا. پامێڕ کە دەستی گەیشت بە قەفەزەکە تەماشای کرد ئەمە شتێکی تێدایە لە وێنەی پیرێژنێکی زۆر پەڕپوت و جادو و ئەفسون دێوەکەی ڕاگرتوە، دەستی نایە سەر دەمی خنکاندی، کە ئەم خنکا دێوەکەش لەوێ تۆپی! تومەز ئەمە کولەکەی ڕۆحی ئەم دێوە بووە!. ئینجا




پەتی کەوانەکەی خستە لاقی و رایکێشا لەگەڵ پوشین دا هاتنەوە بۆ لای پادشاو ئەهلی شار چونە پێشوازیانەوەو هێنایاننە و حەوشەو و حەوت رۆژ شایی و ئاهەنگ بو، پادشا پوشینی لە باوکی سەندو بەڕاو تەگبیری هەموو لایان لە پامێڕیان مارە کردو بەخۆشی رایانبوارد.

بەرامبەر بە ئامۆگاژیەکانی((بەتاح حوتەب))ی میسری ئەمەش نمونەیەك لە ئەدەبی کۆمەلایەتی کوردی کە ئەڵێ: ((مرۆڤ خراپە نەکا خراپەی نایەتە پێش.. کەسێ ئەسپ رابگرێ پێویستە دەرگای بۆ بڵند بکا... مردو گوناحبار نەبێ گۆڕی لێ تەنگ نابێت... مریشك چاوی لە قاز کرد قنگی دڕا.. پیاو کە زۆر شیرین بو لە گەروەوە ئەیخۆن.. هەزار بەرتیل قەرزێ نابژێرێ)). لە ئەدەبی سیاسیدا ئەڵێ:

((کار بە کسێك ئەسپێررێ لە نیوەی ئیشا بە جێ نەیەڵێ.. دەستێك بۆم نەبڕێ ماچی ئەکەم.. دەستێ حاکم بیبرێ خوێنی نیە.. قسە بیگێڕە، بیبیژە، بیوێژە.. زوڕنا بدەرە دەست ناشیەوە فوو بە سەرە گەورەکەیا ئەکات.. پیاو بە گەورەیی فێری پلاو خواردن بو دەست بۆ لوتی ئەبات.. من ئاغاو تۆ ئاغا کێ جێما بۆ راخا؟.. گێرە شێوێنی سوچی گای بنەیە.. خەتی خوار لە گای پیرەوەیە.. کە شا، هات میر بە تاڵە..))

ئەمانە نمونەیەك بوون کەمو کورت لە باری چۆنیەتی ئەدەبی کوردی دا بەرامبەر بە ئەدەبی میسری کۆن.. لەشوێنی خۆیدا باسی ئەم قسە کوردیانەو ئەم پەندی پێشینانە کراوە.

سەرچاوە: مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، چاپی دووەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا.






# في الاكل و الشرب و الاطعمعة

| کوردی | عەربی | فارسی |
| --- | --- | --- |
| خواردن | الاكل | خوردن |
| خواردنەوە | الشرب | اشامیدن، نوشیدن |
| خوراك، خوادرمەنی | الطعام، المأكول | خوراك، خوردنی |
| نان | الخبز | نان |
| ئاو | الماء | اب |
| ئاوی خواردنەوە | ماء الشرب | اب خوردنی، اب نوشیدنی |
| پلاو | التمن- التمن المطبوخ | پلو |
| چلاو | التمن المطبوخ اليابس | چلو، چلاو |
| قوبولّی، یەکاوە | الدم فخت | یكاوه |
| گۆشت | اللحم | گوشت |
| ئاو گۆشت، گۆشتاو | السليقة | ابگوشت،گوشتابه |
| چێشت، ئاو شیو | المرق، الطبيخ، الحساء | اش، ابا |
| چێشتی شلە، خوریشت | المرق | خورش |
| پێ خور، نان خوریشت | الادام، الصباخ | خرش، خوراك، ترنانه |
| قاورمە | القشم، الحميسة | بهار خوشی، قاورمه |
| کەباب، کەواو | الشواء، الكباب | كباب |
| كفتە | الخذيعة، الكبة | كوفته |
| كفتە و شۆربا | الطبيخ المدققة | كوفته شوربا |
| شۆربا، شۆروا | البهضة، الشوربای | شوروا، شوربا |
| پیو، پی | الشحم | پیه |
| دوگ، بەز | الالية، الودك، الوافرة | دنبه، چربی |
| یاپراخ، دۆڵمە | الملفوفة، المحشوة | دولمه |
| سوورەوە کراو | المقلی | سرخ شده |
| ئارد | الطحين، الدقيق | ارد |
| هەویر | العجين | حمیر |

سەرچاوە:

دەستور وە فەرهەنگی زمانی کوردی- عەرەبی – فارسی، عەلادین سەجادی 1962، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا.

# دزی له هۆنراودا

لەم باسی جوانکاری وشەییەدا شتێکی تر هەیە کە بە تەواوی ئاشنایەتی بەم شوێنەوەیە. ئەوەش باسی دزی کردنە لە هۆنراو، و یا پەخشان دا.

کابرا دێنێ هۆنراوی یەکێکی تر ئەکات بە هی خۆی و ناوی خۆی لێ ئەنێت، و یا تۆزێ سەرو گوێلاکی ئەکات و ئەلێت ئەمە هی منە!. هەروەها لە پەخشانیشا ئەم ئیشە ئەکرێت. ئەم هی یەکێکی تر بە هی خۆ کردنە لە دزی ماڵ و سامان خراپترە، چونکە فیکردزین، دزینی مێشکێکی رۆحییە، ماڵ دزین سامانی ماددییە، رۆح لە مادە بە نرخترە.

بەڵام ئەگەر گوزارەیەك دوو وشەی هەبوو، هۆنەرێك وشەیەکی بەکارهێناو هۆنەرێکی تر وشیەکی تری، ئەمە بە دزی دانانرێت. و یا رێ ئەکەوێت دوو هۆنەر- با لەیەك سەردەمیشا بن- لەوانەیە ئاگاشیان لە یەك نەبێت، هەر دوکیان، دوو گوزارە، و یا یەك گوزارە دێت بە دڵیانا و هەر یەکە بە چەشەی خۆیان گوزارشتی لێی ئەدەنەوە، ئەمەش و نەبێت بە دزی ناو ببرێت، بەڵکو بەوە ناو ئەبرێت کە دوو کەس زەینیان بۆ یەك شت وەکو و یەك بووە. دیسان ئەگەر دوو کەس شتێکیان وت، واتە زەینیان بۆ یەك شت وەکو یەك رۆیشتبوو، هی دووەم گوزارشتی بۆ شتەکە لەوانە بوو بەهێزتریش بێت، و لەوانەش بو هەر لە یەکەمیشی وەرگرتبێت، دەست پێشکەری هەر بۆ ئەوەی یەکەمە.

ئەگەر دوو کەس مەعنایەکیان وەرگرت، ئەوەی دووەم یا ئەمەیە وەرگرتنەکەی بە پێزترە لە هی یەکەم، یا وەکو ئەو وایە، یا لە خوار ئەوەوەیە. ئەوەی یەکەمیان بەباش ناو ئەبرێت و رەخنە رووی تێی ئەکات، بەڵام دەست پێشکەری هەر بۆ یەکەمە، ئەوی سێیەم بە تەواوی ئەبێت بە هێلانەی رەخنە.

دیارە ئەم بەشکردنەی بەم جۆرە وەکو بۆ گوزارە وایە، بۆ وشەش هەر وایە. لەگەڵ ئەمانەشا هەموو دەم داهێنان باشترە، تا بەدوو کەوتن و شوێن هەڵگرتن.



***

بەهۆی ئەم باسەوە چەند بابەتێکی تر لە هونەری جوانکاری وشەیی سنگ دێنێتە پێشەوە، چار نییە هەر ئەبێت لەم شوێنەدا باسکرێ. یەکێك لەوانە:

(لێی وەرگرتن)ە.

لێی وەرگرتن وشەیەکەی بۆ هەموو شت ئەبێت، واتە شتێکی گشتی‌یە، هەر شتێکی ماددی،یا مەعنەوی لە شتێکی تر وەربگیرێ، هەر لێی وەرگرتنە. بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە هۆنەر، و یا

**ڕۆڤار**

نوسەر هەندێ وشە بە گوزارە کەیەوە لەشتی تر وەرگرێ و ئەیخاتە ناوبەرهەمەمەکەی خۆیەوە.

ئەمە بەلای زانایانی بەلاغەی عەرەبییەوە بە (اقتباس) ناو براوە. اقتباسیش هەر بۆ ئەو چەمکەیە کە وترا. وەکوو لە وێدا لە گوزارەی گشتییەوە گوێزراوەتەوە. بۆ تایبەتی، لە کوردییە کەشا لە (کلی) یەوە گوێزراوەتەوە بۆ (جزئی).

جا ئەم لێی وەرگرتنە ئەوەیە کە بەرهەمی کەسێکی تایبەتی شتێکی تر بخاتە ناو خۆیەوە، بەڵام نەك بەو ناوەوە کە ئەمە لەوە، واتە باسی خاوەنی لێوەرگیراوەکە نەکا، چونکە ئەگەر باسی کرد، و یا ناوی هێنا، ئەمە بەچەمکی لێی وەرگرتن ناو نابرێ، بەڵکوو ئەبێت بە (تێکەڵکێش).

لێوەرگرتن لە هۆنراو و لە پەخشانیشا ئەبێت، وەرگرتنەکەش تەنیا بۆ جوانکردن وپیرۆزکردنی بەرهەمەکەیە، هی ئەو کەسە کە وەری ئەگرێت

دیسان لەگەڵ ((تێکەڵکێش )) دا بەوەش هەر جیا ئەبێتەوە کە وەرگرتنی تیکەڵکێش لە نیوە هۆنراو کەمتر نییە،هی لێی وەرگرتن، پارچەیە. و لە ما،هێما ناکا بە لێی وەرگیراوەکە. زیاتر ئەم لێی وەگرتنەش هەر روو بەڕووی ((قرآن )) و((حدیث))ئەبێتەوە.

جا وێنە بۆ ئەم لێی وەرگرتنە لە هۆنراودا، کە لێیوەرگیراوە کە (( قران)) بێت. وەکوو ((حیرەت)) ئەڵێت:

***((عیلاجی من لە ساحەی مێحنەتا ((صبر جمیل))..***
***((دەلیلی من خوایەکە،کەوا((نعم الوکیل ))..***
***لە((حدیث)) یشا هەر وەکوو ئەو ئەڵێ:***
***((الجنە حفە بالمکارە) زمایانە لە رووتا))***
***((نی یە ناهەق ئەگەر دایم هەرراکەم من بە دووتا))***

لە پەخشانیشا وەکو و ئەم دەقە کە ئایەتێکی (قران)ی تێدایە و ئەڵێت:

ئەوانەی کە رێگای چاکەیان گرتووە، ئەو چاکەکردنە وە نەبێت هەر بۆ خەڵك بێت، بەڵکو نەفعەکەی بۆ خۆی زیاترە،((ان احسنتم احسنتم لانفسکم)خراپەکردنیش ئەگەر بیکات هەر بۆ خۆی ئەگەرێتەوە (ان اساتم فلها).

وێنەی ئەوەش کەو (حدیث) بخاتە ناو پەخشانەکەیە و، وەکو و لەم دەقەدا، کە ئەڵێت:

(بەنی ئادەم نابێت هەر وا بزانێت کە گیانلەبەرێکە و هیچی تر، بەڵکو وگیانلەرێکە- جگە لە مێشکەکەی- هەموو (کان)ێکیشی تێدایە(الرجال معادن))، لە ئەرزا ئاسن و گۆگرد و خۆی شتی تر هەیە، لە میشا هەیە.

سەرچاوە: خۆشخوانی، علاالدین سجادی، چاپخانەی مەعارف- بەغدا 1978



# رجع الصدى
# لخطاب فخامة رئيس الوزراء

**علاءالدين سجادى**

القى حضرة صاحب السماحة فخامة رئيس الوزراء مساء يوم الثلاثاء المصادف 6 نيسان 1948 من دار الاذاعة اللاسكية خطابا هاماً نبه فيه الناس الى ترقبة. و كان هذا الخطاب الثاني لفخامته منذ تشكيل الوزارة، وقد تطرق الخطاب الى ما كان من وضع المجلس النيابي السابق مما أدى الى حله والى أمر الضائقة الاقتصادية المستحوذة التي كانت تركة ثقيلة من تركات الحكومة السابقة وما قامت بالحكومة من الغاء بعض قيود و ضمان استيراد كميات من الحنطة مع مكافحة التهريب، ثم تطرق الخطاب الى الانتخابات–وهو بيت القصيد– فاكد انها قائمة بتهيئة ما يلزم لاجراء انتخاب النواب بحرية و سلامة.

من الامور البديهة ان الشعب اصبح لايقيم وزنا للخطابات الرسمية التي تصدر من المسؤلين و تلك نتيجة من نتائج العهد البائد، وأثر من آثار فقدان الثقة بين الناس بعضهم البعض و بينهم و بين الحكومة مما تطرق اليه الخطاب، ولم ينس الناس بعد، أن نورى السعيد كان يعقد كل اسبوع اجتماعاً صحفياً يتباهى فيه بان الانتخابات حرة وحين انفضحت الاعيبه دعا المتصرفين كافة و سلمهم قوائم باسماء ممن يجب ان يكونوا تراب المجلس السابق– عليه الرحمة–.

اما خطاب سماحة الرئيس فقد تلقاه الناس غير ما يتلقون به امثال هذه الخطابات، وذلك بالنظر لما لشخصية الرئيس في قلوب العراقيين كافة من الشمال الى الجنوب، من منزلة عالية، ومكانة محترمة مرموقة ونظراً لما لمسوه سينفذه بحذافيره.

وحين أجمعت كلمة الامة على رفض مشروع معاهدة بورتسموث وحل المجلس النيابي السابق لعدم شرعيته، لم تردد سماحة الرئيس– في خطابة الاول– ان يكون ترجمان الشعب، ولسانه المعبر، فكان ما كان من رفض ذلك المشروع الاستعماري البغيض، وحل المجلس النيابي السابق، والشعب ينظر الى شخصية الرئيس والى بعض الوزراء نظرة احترام وتقدير، بل حب وتعاطف، وهذه النظرة لا تحال الا انها الاولى في تأريخ حكمنا الوطني، فقد كانت الشقة بعيدة بين الشعب والحكومة دائماً. فقد كان العداء والبغضاء وسوء الظن قد حال بينهما.

ولكن الشعب وقد علمتها المصائب ان يكون حذراً والا يسرف كثيراً في التفاؤل، ينظر بعين الاشفاق الى ما حدث اخيراً من اقصاء وزير معروف باستقامته ونزاهته واخلاصه الى مجيىء وزير آخر بوكالة



وزارة الداخلية وهي الوزارة التي لعلها تقوم بدور فعال في معركة الانتخابات، وهي التي تتوقف على نزاهة موظفيها وحيادهم حسن قيامهم بواجباتهم مهمة الانتخابات بحرية وسلامة.

تستطيع الادارة بوسائلها المختلفة التي لا تصل اليها يد القضاء ان تؤثر في سير الانتخابات الى الجهة التي تريدها، وبالاخص في خارج بغداد حيث الناس اكثر بساطة واشد رعاية لهيبة الموظف الادارى وسلطانه، خاصة اذا علمنا بانه لم نؤسس بعد تشكيلات حزبية قوية تأخذ بيد الناس وتكون في صفهم، وتعبر عن حالهم وتراقب سير الانتخاب، وتضرب على ايدي الموظفين الذين تسول لهم انفسهم الوقوف في صف زيد ضد عبيد.

يجوز لرئيس الادارة المحلية ان يدعي الحياد فيقف موقفاً سلبياً أمام تصرفات مرؤوسيه الاداريين، فيكون هذا الحياد – الذي هو تدخل في واقع الامر– تدخلا فعليا، فهو تدخل من الجهة العليا بصورة سلبية، لينعكس تدخلا اجابيا من الجهة السفلى.

نريد من وزارة داخلية ان تعمم منشوراً على جميع رؤساء الوحدات الادارية من كبيرهم الى صغيرهم تحذرهم من التدخل في الامور الانتخابات وتلفت انظارهم الى المواد الجزائية الواردة في القانون التي يترتب على مخالفتها ايقاع العقاب القانونى اللازم، و نؤكد عليهم بانها واقفة فى المرصاد لكل من تنازعه نفسه منهم الى خرق حيادة، و نريد من معالي وزير العدلية ان يدعوا اليه رؤساء محاكم الاستئناف ويطلب اليهم ان يبلغوا رؤساء المناطق العدلية بأن يقوم الحكام بواجباتهم المنصوص عليها في قانون الانتخابات بكل دقة وعناية، ويطلب اليهم ان يسوقوا كل من يحاول التأثير في سير الانتخابات مهما كان يسيراً الى دور العدالة لينال ما يستحقه من عقاب، فهل سنجد من اولى الشأن أذناً صاغية لاقتراحنا هذا، وليس هو عليهم بعسير؟

اننا نعتقد بان الانتخابات المقبلة مهما سيكون لونها فسوف لاتعبر كل التعبير عن آمال هذه الامة وأمانيها، ففي الواقع ان الانتخابات على درجتين انما هو مجاف للروح الديموقراطية السائدة ومن الواجب نبذ هذا القانون وسن قانون آخر محلة من قبل المجلس القادم.

ومهما يكن والانتخابات اليوم قد بدأت أو كادت، فهناك حزبان هما الشعب والاتحاد الوطني لا يزالان مسحوبي الاجازة ولا نعلم الا ان سحب اجازتيهما من قبل الحكومة الماضية انما كان اعتداء على النظام الديمقراطي الذي من أسسه الابتدائية انشاء التشكيلات الحزبية، فهل آن للحكومة ان تعيد اجازتيهما ليقوما بدورهما في النضال الانتخابي؟ أم توجد هناك تهم صحيحة ضدهما فليقدما الى ساحة العدالة ليحاسبها عن هذه التهم، فيحصحص الحق ويزهق الباطل انه كان زهوقاً.

